خوێنەری بەڕێز، لەبەر ئەوەی هەندێ وشەی نامۆ لە ناوچە جیاوازەکانی کوردەواری لەناو ئەم ڕشتەیەدا بەرچاو ئەکەوت، بە باشمان زانی وشەدانێکی سووکەڵانەی بۆ دابنێین، تا ببێتە چاوڕۆشنییەك بۆ ئێوەی خۆشەویست.

١ - هەندێ لەو وشانە کە لەنێو کتێبەکەدا هەن و لێرە بەدی ناکرێن، دوای سۆراخ‌کردن و گەڕانێکی زۆر، نەمانتوانی ماناکانیان بەدەست بێنین، بەم‌بۆنەوە داوای لێبوردن دەکەین.

٢ - بڕێ وشە لە زاراوەی ناوچەکانی‌تر هەبوون، بۆ ئەوەی خوێنەر ئاگاداری ماناکەیان بێ، زۆرترین تەلاشمان کردووە کە نزیکترین مانا بخەینە پێش‌چاوی ئێوەی ڕێزدار، جا ئەگەر مانای وشەکە بە تەواوی ساغ نەکرابوویەوە، بەهۆی کەمتەرخەمی ئێمەوە نەبووە.

٣ - بۆ هەندێ وشە زیاتر لە چەند مانامان هێناوە، تاوەکوو ئەسڵی مەبەستەکە بێتە جێ، وە زۆر جاریش پێویست بووە و وردەشیکارییەکمان بۆ کردووە، هەرچەن ئەسڵی مەبەستیش نەبووبێ، بەڵام ڕێگایەکی ئاسانکارییە بۆ پڕکردنی هەگبەی زانیاری زیاتر لەسەر وشە و ئەدەبیاتی کوردی.

٤ - لە هەر شوێنێکا هێمای ئێسلاشتان بەرچاو کەوت ( / )، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مانای پێشوو تەواو بووە، دوای ئەمە مانایەکی جیاوازترە بۆ ئەم وشەیە کە شایەد مەبەستەکە لێرەدا ستاری گرتبێ.

٥ - بۆ ئەم فەرهەنگۆکە کەڵمان لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەگرتووە:

(ا: هەنبانە بۆرینە. مامۆستا هەژار.

(ب: فەرهەنگی هەژیر. (ئەپلیکەیشن) هەژیر عەبدوڵڵاپوور.

(پ: فەرهەنگی ئاناهیتا. (تۆڕی ئینتەرنێت) یووسف ڕەشید.

(ت: فەرهەنگی کوردستان. گیوی موکریانی.

(ج: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی کوردپیدیا و فەیسبووك و کەناڵە تلێگرامییەکانی تایبەت بە وشە و جوگرافیای کوردستان.

## أ . ئ

**«أبيض»**: سپی.

**«أخضر»**: سەوز.

**ئابووری**: ماڵداری، (اقتصادی).

**ئاتاج**: نیازمەند، چاو لەدەست، نەدار، فەقیر.

**ئاخڵە**: خەرمانـە، خەرمان، تەمومژی دەوری مانگ، خەرمانەی مانگ/ کەوانە، چەمەرە/ هەر شـتێکی وەك ئاڵقە، کادان، لەوەڕدان، تفاقدان، پوێنی هەمبارکردنی کا و گزرە و ئاڵف.

**ئاخوون**: مامۆستای ئایینیی شێعە.

**ئاردەوا**: پەڵوولـە، پرپۆڵـە، حـەودەل، ئـەو شۆربایەی کە لە ئارد و کووزەڵە دروست ئەکرێ.

**ئاروو**: خەیار.

**ئاری**: ئاریایی، مەبەست لێرەدا فارسە.

**ئازاڵە**: سووتەمەنی زستان لە تەپاڵە کێویلە.

**ئاس**: قاقم، جۆرێکە لە گیا.

**ئاشبەتاڵ**: دەست کێشانەوە لە ئیش و فرمان.

**ئاغابانوو**: مێزەر، سـەرپێچ، جامەدانە، دەسرە و شەدە، ڕەشتی، سەروێن، مەندیل، پارچەی لە سەر پێچراو.

**ئاگردان**: مەنقەڵـی، ئـاورگا، ئاتەشـگا، ئـارگا، کووره، وجاخ.

**ئاگرە**: جۆرە نەخۆشینێکی پێستییە بەشێوەی بلۆق و زووخاو دەردەکەوێ، ئاورە.

**ئالیك**: ئالێـك، ئاڵـف، لـەوەڕ، ژەمـە جـۆی حەیوانی یەكسم.

**ئامە**: ئامینە.

**ئانیشك**: ئەنیشك/ یەرەژنە، نێرەژنە.

**ئاوزەنگی**: گیان‌کەنشت/ گیانەڵا، سەرەمەرگ.

**ئاونگ**: شەونم، زوقم، ئاوەنگ.

**ئاوەڕووت**: ئـەو باڵندەی کـە بە ئاوی کوڵاو پەڕ و باڵیان لێ کردبێتەوە.

**ئاوەڵدامان**: دامەنـی درێـژ، داوێنـی کراس، بەشی خوارەوەی کراس، پاڵدامنە، پەراوێز.

**ئاوەڵکراس**: دەرپێ، پانتۆڵ، ڕانك.

**ئاوەنیا**: دەغڵی کە لە پێشدا زەوییەکەی ئاو دراوە و دواتر تۆوی لێ چێنراوە.

**ئاوێژ**: هاوێژتن، پاشبەند «دوورئاوێژ».

**ئایشێ**: «عائشە».

**ئاینوئۆین**: نازونووز، ناز و ئەدای بێ‌جێ.

**ئایەم**: ئادەم.

**ئەبیەت**: ئەبیسێت.

**ئەحوەل**: خێل، چاولار، چاوگێڕ، چەم‌لار، خوێل.

**ئەڕا**: بۆ؟، ئەڕای چی؟: بۆچی؟، لەبەر چی؟.

**ئەڕات**: بۆ تۆ، پەی تۆ.

**ئەز**: من، ئەمن.

**ئەسابیع (أصابیع)**: پەنجەکانی دەست و قاچ.

**ئەسکەمل**: سەنگەڵی، سەندەڵی، کورسی.

**ئەشرافی**: دەوڵەمەندانـە، مـاڵ و خواردنـی ئەریستوکراسی.

**ئەغزە**: فیلتێری جگەرە، پاڵوێنە، پاڵێوکە.

**ئەفەندی**: ئەفەنـی، خوێنـەوار، ڕۆشـنبیر، وشەیەکی عوسمانییە بۆ ڕێزنان لە پیاوی پلەدار، هەنـدێ جاریـش وەك جنێـو و سـەرکونەکردن بەکار هێنراوە.

**ئەکل (أکل)**: خواردن.

**ئەلەم (ألم)**: ئازار، ئێش، دەرد.

**ئەنف (أنف)**: لووت.

**ئەوزار**: ئامێر، ئامراز، (ابزار).

**ئەی**: ئەم، ئەمە، ئاماژە بۆ نزیك.

**ئەیە**: ئەی.

**ئۆباڵ**: گوناح، تاوان، وەباڵ، سووچ.

**ئۆدە**: هۆدە.

**ئۆقرە:** ئاسوودەیی، ئۆخژن، سەبر و لەسەرخۆیی، هێوری، سوکنایی، سرەوتن، ئارامی.

**ئیزرائیل (عِزائیل):** گیانکێش، فریشتەی مەئمووری گیانکێشان.

**ئیسرافیل (إسرافیل):** فریشتەی مەئمووری فووکردن بە شاخی «صور»دا.

**ئیمپریالیزم:** یاسا و نیزامێك كە بە بیانووی ڕامیاری و ئابووری ئەیەوێ سنووری نەتەوەیی و نیۆنەتەوەیی خۆی و وڵاتان ببەزێنێت و بیانهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی.

**ئینجە و فینجە:** خۆ نواندن، دەمار، فیز، شکۆ و زرموکوتی حەشاماتی هاوڕێی گەورە پیاو، ناز و نووز.

**ئێجگار:** ، گەلێ، فرە.

**ئێرەق:** هێرەق، یەرەق، هێش، ئامرازی جووت‌کردن، ئاموور.

**ئێستگە:** ئیزگای ڕادیۆ/ وێستگە، شوینی هاتنە خوارەوە.

**ئێلاخ:** ئێڵاخ، هاوینەهەوار، لەیلاخ، زۆزان، کوێستان، ئێلاق، هەوار.

# ب

**بارخانە:** ئەنبار، عەمبار.

**بارگیر:** یابوو، بارگین، ئەسپی باربەر.

**باسترمە:** باستورمە، کاڵباس، گۆشتی قیمەی سوێری سوورەکراو بە بەهارات کە لە ڕیخۆڵەدا ئاخنرابێت.

**باستیك:** باسووق.

**باسووق:** باستیك، باسلوق، باسووخ، جۆرێکە لە شیرینی کە لە نیشاستە دروست دەکرێ (راحةالحلقوم).

**باشار:** خۆڕاگری، تاقەت، وەرگە، دەرەقەت، بەرەنگاری، بەرخۆدان، بەربەرەکانێ.

**باشقە:** شاز، بژاردە، دانسقە، سەرگوڵ، کەم وێنە، شتی نایاب، نموونە، مودێل.

**باشوور:** جنووب، لای خواروو، پانیشت.

**باقڵێکم:** بە عەقڵم.

**باکوور:** شیمال، لای ژوور، سەرنیشت.

**باڵوێز:** نوێنەر، باڵیۆز، بەرزترین سپاردەی وڵاتێك لە وڵاتێکی‌تر.

**باڵەخانە:** ئاپارتمان، سەرسەرا، سەرخان، تەلار، کۆشك، هەیوان.

**باوڵ:** باول، چەمەدان، جانتا، باوەڵە، ساك، باولە.

**بتەو:** پتەو، توند، سفت، قایم، سەخت، ڕەق، خەست.

**برووسکە:** تلگراف، ڕاسپێری، تەلەگرام، پەیام، پەیغام، وەحی، ترووسکە، بریقە، تریشقە، چەخماخە.

**بریا:** خۆزگا، خۆزی، خۆزیا، کاشکا، شەڵای، بریکا.

**بز:** جووز، سووك، کلکەقنگێ، کلکەبزێ، دەسەژی/ واق، وڕ، زەق، ئەبڵەق.

**بزاڤ:** حەرەکەت، جووڵە، بزووتنەوە، تەڤگەر، ڕاپەڕین، شۆڕش.

**بزرکان:** ڕەنگ پەڕین، ژاکان، سیس، پرووکاندن، تاسیای، پەشۆکان، حەپەسان.

**بزوو:** جووڵە، ئاخێز، دارەبی.

**بزووت:** چلۆسك، کۆڵەوەژ، چلوسك، سکڵ، داری نیوە سووتاو، داری نێو تەنوور و ئاگردان کە هێشتا دووکەڵی لێ‌هەڵسێت و گڕی دانەمرکابێ.

**بست:** بنگووس، بۆس، بنگس.

**شاخی شەیتان:** کینایەیە لە ئینکاری‌کردن، ملەجڕێ.

**بسك:** زوڵف، کەزی، ئەگریجە.

**بلە:** ئیبراهیم.
**بنج:** بنچینە، بناوان، ڕیشە، بنەما، بناخە، بن.
**بنگووس:** بنگوست.
**بن‌میچ:** بنەبان، ئارووك، سرمیچ، سەقف.
**بنەنگڵ:** بن‌هەنگڵ، ژێر باخەڵ، بن‌باڵ، ژێرباڵ.
**بوخچە:** پریسکە، پریاسکە، پریازگ.
**بووشم:** بێژم.
**بە توون:** قیروسیا.
**بەدفەساڵ:** ڕەزاگران، ئێسك قورس.
**بەراز:** خووگ، خیگ، گاكوڵ، وەراز.
**بەرچاوتەنگ:** بیرکورت، کورت‌بین، وەرەچەم‌تەنگ، بیرتەسك/ ڕژد، خەسیس، دەس قووچاو، چاوچنۆك، بەخیل، بەئێرەیی.
**بەرچاوتێر:** دەسودڵباز، دڵاوا، بەخشندە، دەسڤاڵا، جوامێر، سەخی، نان‌بدە.
**بەردەنوێژ:** شوێنێکی دروستکراوە لە تەختەبەرد چیمەنتۆ و... بۆ نوێژکردن لەسەری.
**بەرقلیان:** بەرکوڵ، وەردڵ، قلیان‌قاوەڵتی.
**بەرگدروو:** بەرگدوور، دروومانکار، جلکدوور، مەکینەچی، خەیات.
**بەرماخ:** قاقەزی جگەرەی دەسپێچ کە تووتنی تێدەکرێت.
**بەرەکەت دا:** خوا بدا بەرەکەت.
**بەرەواژە:** پێچەوانە، چۆپەوانە، سەراوبن.
**بەز:** پی، پییە، دۆن، چەوری ناو زگی ئاژەڵ، دووگی پەز.
**بەستوو:** ڕەق‌هەڵاتوو، ڕچیا، گرسیاگ، چەق‌بەستوو/ کووپ، هومە، (خُم کوچك).
**بەقرەچ:** سەتڵ، تەشت.
**بەکرە:** قرقرە، مەکارە، کندر، ئامێرێك بۆ کۆکردنەوەی زنجیر و مەکارە و دەزوو و کاموا و...

**بەڵم:** لاسکی هەرزن، ساقەی گیا لەناو ئاڵفدا/ بەهانە، بیانوو، بەهانێ، بیانك.
**بەلەپا:** خێرا، خۆشڕۆ، بەدەو، تیژڕەو، گورج، خۆشبەز، کەروێشك.
**بەلەك:** خراپ/ ئاژەڵێ کە یەکێ لە پێیەکانی سپی بێ/ مێکۆك، بەلیەك، مەڵیم، مێمۆك، گیایەکی ئاڵفی خۆڕسکی ڕەنگ زەرد و شیرتاڵە لە تیرەك نۆك. (شیرین‌بیان)
**بەلۆعە:** شێری ئاو.
**بەنگ:** وەخت، کات، گەڵا/ بەڵگە، سەنەد/ جێگیر، نیشتەجێ، نەمر، مەندۆخ/ بەنج، ئەو دەرمانەی کە بۆ سڕ کردن و بێهۆش‌کردن کەڵکی لێوەردەگیرێت/ شادانە، شاینە، گیایەکی یەکساڵەی جۆراوجۆرە کە لە ڕیشاڵەکەی ڕۆن، دەرمان و ماددەی هۆشبەر دروست دەکرێ.
**بەنەوخوێن:** بەنەخوێن، پەتی بەستنی پانتۆڵی کوردی، گونجەنە، هۆجەنە، وەنجەنە، دێخوون.
**بەو:** بێ، وەرە، بۆ.
**بەوە:** بەو.
**بەی:** بەمە، بەم، بە ئەمە، پینەی/ بەهێ، میوەیەکی بۆن‌خۆش و خڕ و زەردی پاییزییە.
**بەیات:** خۆراکی شەومەنە، پەزێرە، کارتۆ/ ناوی عەشیرەتێکە/ ناوی مەقامێکی مووسیقییە.
**بەیاتە:** ڕۆنی هەڵکزراوی پی و دووگ.
**بەیداخ:** ئاڵا، بەیاخ، ئەژدەر، دروشم، پەرچەم.
**بۆری:** ڕەشی کاڵ، ڕەنگی تووسی، بۆر/ هۆڕن، بۆق، شووت/ شووشەی چرا لامپا/ ڕابردوو/ لوولەی ئاو.
**بۆڕی:** کەڕەنا، شەیپوور، توتوك، زوڕنای لەشکر/ هەرشتێکی درێژی ناو بەتاڵ و خاڵی/ دووکەڵکێشی سەماوەر، دووکەڵگیر، لووژن، لوولە سۆمپا.

**بۆژە:** بێزار، هەراس، ڕق، کینە/ ئاڵفی دەست لێدراو، ئاڵفی بۆدار کە ئاژەڵ و وڵاغ لەبەر بۆنەکەی بێزی لێبکاتەوە، بۆژۆ.

**بۆش:** ناوخاڵی، بەتاڵ، کلۆر، قەڵپووت، پووچەڵ، پووك، پووت/ زۆر، فرە، گەلێك، زێدە، پڕ.

**بۆڵ:** دەنگی بەم وەك دهۆڵ/ هێشوو، تیسك، دانەی هەنگوور، دنكەترێ.

**بۆن:** لایەن، بار/ بێن، بۆ، بووە، بەرامە/ بڕوانە/ بۆ ئێمە.

**بۆی:** گارسۆن، شاگرد، خزمەتکاری ڕستووران.

**بیزا:** بەیزا، گیایەکی خۆڕسکی کوێستانییە.

**بیلبیلە:** گلارە، گلێنە، کچێنە، کۆڤان، ڕەشێنەی چاو، کونیکی بچووکە لە ناوەڕاستی چاو کە تەنیا ڕێگای گەیشتنی ڕووناکییە بۆ گۆیچاو.

**بیم:** ببم/ بووم/ هەراس، ترس لە شتیك کە داهاتوودا ڕوو بدات.

**بین:** نەفەس، هەناسە/ قوڕگ، ئەندامی بەرهەمهێنەری دەنگ کە دەنگەژێکانی تێدایە (حنجرە).

**بینایی چاوان:** مەبەست خوایە.

**بینجوو:** وردە پووڵی ڕووپیەی وڵاتی هیند.

**بیور:** تەور، تەوەرزین، باڵتە، تەوەر، تەڤر، ئامرازێك بۆ شکاندن و بڕینەوەی دار.

**بێژنگ:** بێژن، زوخمە، کەمە، قەلبیر، بۆ لە هێڵەکدانی شتی دەنك قەوی وەکوو گەنم و نۆك و خاك و...

**بێشەمە:** بێشەما، جۆرێك تووتنی بۆندار و زۆر باشە.

## پ

**پاپۆڕ:** کەشتی، گەمی، بەلەمی گەورە.

**پاچاڵ:** پێچاڵ، قوڵکەی ژێر پێی جۆڵا.

**پارگین:** خەتێکە وەکوو خەتی جووت لە دەوری دەوارا لێئەدەن بۆ ئەوە کە باران باری ئاوەکە بەوێدا بڕوا و نەیەتە ناو دەوارەکە.

**پازار:** گرانیت، بەردێکی مەعدەنی گرانبەهایە بۆ خشڵ و جوانکاری.

**پاسار:** گوێسوانە، پەلەسوانە، پاسارە، کەڵکەپاسار.

**پاشبازی:** نێربازی.

**پاشقول:** پاچەقولێ، فێڵێکە لە زۆرانبازیدا.

**پاشمیز:** میزەچرکێ.

**پاشەڵ:** دوابەشی کارێك یان شتێك، پاشەکی، بەشی دواوەی لیباس و داوێن، لاقنگ، کەفەڵ.

**پاڵتۆ:** پاڵتاو، باڵتۆ، باڵاپۆشێ کە کووتاڵی ئەستوورە و زستانان لەبەر سەرما لەبەری دەکەن، قاپووت، سرقۆ.

**پاڵەپەستۆ:** بۆق، فشار، زۆر، تەوژم، پاڵەپەستێ، لێش، هێز/ ئاپۆڕە، حەشامات، تەمموورە، قەرەباڵغ.

**پانکە:** باوەشێنێکی کارەباییە بۆ فێنك کردنەوە لە کاتی هاویندا، باوەشێن، بارۆشە.

**پچکۆڵە:** بچکۆلە.

**پرپۆڵە:** شۆربای نیسکێن، پەڵووڵە/ خۆراکی جووجەڵە دروستکراو لە ئارد.

**پرتاو:** لێنگدانی ئەسپ، غار، هەشتاو/ خوڕ، بە خوڕ، بە تەوژم/ هاوێشتن، پرتاڤ، تووڕدان، فڕێدان.

**پرزە:** هێز و توانا، تاقەت و وزە، قەوەت/ تاو، تین، توانایی.

**پرزۆڵە:** تیکە قوماشی کۆنە و دڕاو.

**پرکێشی:** پێداگری، لاساری، سەرسەختی، لەنج، یەكدەندەیی، ملەجووڕێ، ڕووداری.

**پرمە:** پرمە، بۆڵەبۆڵ، پرتەپرت، پرتەوبۆڵە،

لووتوپووت، خوتەوبۆلە، ورنگەورنگ/ پەڵمەگیر، گریان، گریانی کتوپڕی، لووشکەلووشك، قوڵپەی گریان، مرقەمرق/ قاقا، حیلکەحیلك، پێکەنینی بەدەنگ/ دەنگی لووتی ئەسپ.

**پروپاگەندە:** بانگەشە، تەبلیغات، ڕێکلام.

**پریاسکە:** بوخچە.

**پسمام:** ئامۆزا، مامۆزا، کوڕەمام.

**پسوولە:** پەتە، بلیت، ئیزن‌نامە، ئیجازەنامە، مۆڵەت‌نامە، نووسراوەی فەرمی بۆ ڕێگەپێدان و ڕەزامەندی بە کارێك یان چوون بۆ شوێنێك یان وەرگرتنی شتێك.

**پشتکۆڵ:** شەوژەن، شەوبەن، چلمێردە، چۆڵەپێچ، چۆڵەپێچەن، باڵین، پشکۆڵ، دەرگا پشت‌خستن، چێو یان هەر ئامێرێکی داخستنی دەرگا لە ژوورەوە.

**پشتیر:** تەویلە، گەوڕ، زاخە، ئاخلە، پەچا، جیخ، شوێنی ئەسپ و هێسر و وڵاخ و ئاژەڵ.

**پشقل:** پشکڵ، پشکەڵ، پشقەڵ، پەیینی بزن و مەڕ و وشتر و کەروێشك.

**پشك:** بەرەبین، بەرەزوانە، پزوو، دارێك بۆ بەستنی سەری مەشکە و خیگەی پێستین، پسوولەی بەختانی، قورعە، خۆت و بەخت، تیروپشك

**پشکۆ:** سکڵ، پۆلوو، پەرەنگ، پزیسك، سکەڵ.

**پلار:** سەرکۆ، سەرزەنش، سەرکۆنە، لۆمە، دەمکوت، کۆڕان.

**پلیشان:** پلیشاو، فلیقیا، پلت، پانکردنەوە.

**پنچك:** دەوەن، هەژگ، تەپکە، بنەگیا، پنجار.

**پنگر:** پشکۆ.

**پواز:** ئاوێزە، ئارێخە، سینگ، مێخەتەوێڵە، نێرك، چیلکە، زوانە، دار یان بەرد یان ئاسنێك بخرێتە درز و قلێشێکی دار و بەرد بۆ شکاندن و لەیەك جیاکردنەوە.

**پووت:** کوڵ، پەرپووت، ناوخاڵی/ تەنەکە.

**پوول:** پەنابا، شایی، قرووش، وردە پووڵێکی کەم، (پَشیز).

**پەپکە:** خۆ کۆکردنەوە، خەرمانی نەکوتراو، مووچەی نان، ئاخلە، پەپلە.

**پەتك:** پەت، بەن، گوریس، وەرێس، گردێنك، خوری ڕێسراو.

**پەر:** پەز، مەڕ، مەی، مەڕی سپی سەرومل ڕەش.

**پەرپووت:** پەرپووت، نابووت، مایەپووچ، ڕووت، پووچەڵ، لەڕولاواز، ڕزیو، داڕزاو، پرتووکیا، هەلار، شڕ و کۆنە.

**پەرجۆ:** موعجیزە.

**پەرداخ:** پۆشتە/ لەبار، ڕێکوپێك، ئامادە/ لیوان، کەرەستەی ئاو خواردنەوە، پیاڵە.

**پەردەپلاو:** خۆراکێکە کە لە برنج دروست ئەکرێ، جۆرێکە لە پلاو.

**پەرموون:** باوەڕ بە خۆ بوون، ڕابینین، متمانە، پەرمیای، (اعتماد بە نفس).

**پەشتەماڵ:** خاولی، ئاوچن، مەرحەمە، پشتەماڵ، خافلوو.

**پەشمەك:** جۆرێکە لە شیرینی.

**پەککوو:** ئۆف، وەی، ئای، داخی گرانم، ئەی داد، حەیف، وشەی بێزاری.

**پەکوو:** تاح، تەحا، حاح، ئەح، پێم سەیرە، کاتی پێ‌سەیر بوون، سەرم سووڕ دەمێنێ.

**پەلك:** پەژە، گەڵا، پەڵك، وەڵگ/ پەلکە/ پێڵووی چاو.

**پەلکە:** پەلك، پەلکێ، چەپکە پرچ، زوڵف، پەرچەم، ئەگریجە.

**پەڵوولە:** پرپۆلە.

**پەلێك:** شۆربای زۆر کوڵاو/ تۆق، ئەوەی کە قژی پێ ئەبەسترێ. (زلف بند).

**پەنگ:** پشکۆڵ، وەستاو، ڕاوەستاو، چەق، بێجووڵە.

**پەوڕوو:** دوولۆر، دەمەوڕوو، لنگەتلوور، بە ڕوودا کەوتوو.

**پۆتەڵاك:** پۆتڵاك، سەروسیما، سەروگوێلاك، سەروسەکوت، سەروقڵخ.

**پۆڕ:** باڵندەیەکی خۆشگۆشتی لاق درێژە/ پەرین، بەربڵاو، پانوپۆڕ، بەرپان، لەبار.

**پۆڵۆن:** وڵاتی لهستان.

**پیتاك:** داهاتە،ماڵیات، باجی دەوڵەتی/ کەلوپەل، شتومەك، چشت.

**پیر:** پێشوازی/ بە ساڵاچوو، ڕیشسپی، مرۆڤی بەتەمەن/ ڕێنما، مورشید، شێخی تەریقەت.

**پیرۆت:** کۆزەگەر، هەورگەر، کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ دەکات/ ناوێکە بۆ پیاوان.

**پیسکە:** بەرچاوتەنگ.

**پیلان:** پاپۆش، کەینوبەین، دەسەداو، نەخشە، تەگبیر، فرتوفێڵ، کەڵەك.

**پینگ:** پیشخواردنەوە لە ڕقا، پینگاندن، ناڕەحەتی لە ناخەوە.

**پێپلیکان:** قاڵدرمە.

**پێپلینك:** پێپلیکان.

**پێپیلکە:** پێپلینك

**پێچ:** چەم، قەمچ، باو/ سەروێن، سەرپێچ/ با دراو، لۆلۆ، پێچراو، پێچیا، هەڵکراو، لوول.

**پێچاڵ:** پاچاڵ.

**پێچەڵپلووچ:** پێچاوپێچ، پێچوپلووچ.

**پێخوێ:** پەسا، ئەو قورەی بۆ سواغ گیراوەتەوە.

**پێخەسوو:** پاوەوی، پاوەیو، بەربووك، ئەو ژنەی لەگەڵ بووك دەچێتە ماڵی زاوا و ڕێنماییان دەکا.

**پێرۆ:** ئەستێرەی سورەییا/ مێروویەکە چاوی ئاژەڵان کوێر دەکات/ مناڵی تازە پێگرتوو.

**پێز:** کێشهاتن/ هێز، بەتین، بەتوانا/ مەڕ، پەز، مێ، مەی/ بەرەکەت، پیت.

**پێك:** پیاڵەی شەراب.

**پێکوڕە:** نۆکەری ماڵ/ کارەکەر، خوڵام.

## ت

**تاپۆ:** بەڵگە، قەباڵە، بنچاخ، سەنەد.

**تات:** تەختەبەردی ساف بۆ بەردەنوێژ.

**تاس:** سەری بێموو، هەوێز/ وەناق، پیران، خەفە، هەناسەبڕان/ دەفری قووڵی لە مس سازکراو، تەشت/ گێژ، وڕ، کاس.

**تاسکڵاو:** سەرپارێز، کڵاوی ئاسنین، کڵاوزرێ، کڵاوخوود.

**تاسولووس:** ڕازان، خەمڵان، خۆ جوانکردن، سووراو و سپیاوکردن، ئارایشت، ڕازاوە، سافولووس/ لاولووسە.

**تاسە:** ئارەزوو، مەیلی دەروونی، ئاوات، حەز، کورکەکورك، موشتاق، تامەزرۆ.

**تاعوون:** بەڵا، ئەوەی ئەبێتە هۆی قڕکردنی خەڵك/ گاقڕان، تاعوونی ڕەشەوڵاغ، قۆڕە/ چاوەقووڵە، ئافەتە، نەخۆشینێکە لە ڕێگەی مشکەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە کە بە لەرز و تا و سەرئێشە و ڕشانەوە و زگچوون دیاری دەدات و هەندێ جاریش هۆی مردنە.

**تاڤگە:** تاف، بافڵ، بەرزاو، ڕێژاو، سوڵاڤ، قەڵوەز، قەڵبەزە، شۆڕك.

**تاقی:** ئەزموون، ڕاکاو، ئاروین، کرێشە، سەنگان، پرۆڤە، ڕاهێنان.

**تاڵان:** غارەت، ڕاوڕووت، چەپاو، پوور، یاخمە، کاڵەت.

**تالع:** تالح، هات، بەخت، کۆست، تاڵە، ناوچاو، چارەنووس.

**تاڵە:** تالع.

**تامازرۆ:** تامەزرۆ، تاسە.

**تانجی:** تاژی، سەگی ڕاو.

**تانووت:** تانە، تەشەر، قەرف، تەزەك، توانج، سەرزەنشت.

**تاو:** تین، گەرما/ غار، چوارناڵە/ هەتاو، تیشکی خۆر/ توانایی، پرزە/ وزە، هێز، گوڕوتین.

**تاوس:** جۆرێکە لە یاری، پەلەوەرێکی جوان و نەخشینە.

**تخووب:** سنوور، کەوشەن، سەرحەد، سەرخەت، کەرخ، حدوود، مەرز، ناودۆژ، ناوهێڵ.

**ترخێنە:** شەلەم، تەرەساز، شەلەمین.

**ترمبێل:** ترۆمبێل، ئوتۆمۆبێل، ماشێن، سەیارە.

**ترِوتفاق:** کەلوپەل، کەرەستە، ترتفاق، بارگەوبنە، پێداویستی/ کەلوپەلی شەڕ، تەقەمەنی.

**تفت:** تامی گیر، چێژی زوانگیر، نیوە تاڵ و تیژ.

**تگە:** نێرەبزن، بەران، حەچە، سابرین.

**تل:** لەتر، ڕەت/ خلۆر، خلار، تلێر گلار/ قامك، ئەنگوس، ئەموست، پەنجە، گلکە/ جووڵە، تەکان، جمە، لەرە، ڕیپ.

**تلیاك:** تریاك، یەکێ لە مادده سڕکەرەکان.

**تولەباب:** سەگباب.

**تومەز:** تمەز، مەگیر، گوایە، گۆیا، وەك شتێ، ئێژی، تومەس.

**تووش:** گیرۆدە، گرفتار/ تووشیار/ بەدفەڕ، بەددڵ/ ئاڵۆز، سەخت، دژوار، سەخڵەت، ئاستەم/ پێچەڵاوپێچ/ سەرشێت، هەرووم/ شەڕانشۆ، گونجڕ، توخس، چەتوون، دانەسەکناو، تووتڕکەسەر، سەرکێش.

**توون:** توند، تیژ، کەسکوون، زمانگەز، خەڕا/ ئاگردانی گەرماو، ئاورگ، توونخانە، هێتوون/ جەحەنەم، جەهەننەم، دۆزەخ.

**توێ:** ئەبێ، ئەشێ، توا، ئشیۆ.

**توێژ:** تووژاڵ، توەە، چین، کۆیەڵ، بەرە، پێر.

**تە:** تۆ (لە زاراوەی شکاکیدا).

**تەپاڵە کێویلە:** سەنێری چەنمانگەی مانگا و وڵاخ کە بەهۆی باران و بەفرەوە ڕەنگی پێوە نەمابێ.

**تەخمین:** مەزەنە، مەزندە، مەزننە، هەڵسەنگان، بەراورد.

**تەریدە:** ڕێگر، چەتە، ڕاگر، ڕابڕ، جەردە، دزگەردەنە، سەرملەگیر.

**تەریك:** گۆشەگیر/ خەڵوەت، کونج، شوێنی بێهەراوزەنا.

**تەژبی:** تەشپی، وێچوون، هاووێنە، وەك، تەژبیات.

**تەشپی:** کاسەی دارین/ قەرەبووی گوناح/ وەکوو، تەژبی، کار یان ڕەوتی لێكچواندن، وێك چواندن، شوبهاندن/ تەبەقە، دەفرێکە لە دار یا هەر شتیتر وەك لەگەن.

**تەغار:** تەخار، یەکەیەکی کێشان یان پێوانی دەغڵودان.

**تەقاوێت:** خانەنشین، کارکەنار، یانەنشین، پاشکار. (بازنشستە).

**تەڵە:** داو، کەرەستەیەك بۆ گرتنی گیانلەبەران.

**تەلیس:** گۆنی، گوێنوو، گونی.

**تەڵەبەر:** هەڵکەوتە، دەگمەن، کەموێنە.

**تەنگەتاو:** بەپەلە/ قەڵس، توورە، هەڵچوو/ تەنگاو، زۆربۆهاتوو بۆ دسبەئاوکردن یان لە شوێنێ گیری خواردبێ/ گیرکردن، بەگیرهێنان.

**تەنوورە:** ئاوەڵدامان/ دامەن، داوێن، جۆرە جلێکی ژنانەیە کە لە کەمەر بەرەوخواری

دادەپۆشێت.

**تەنەکە:** پووت.

**تەوژم:** گوشار، گوژم، پاڵەپەستۆ.

**تەوەزەل:** تەمبەڵ، بێکارە، سست، لەشگران، لەشقورس.

**تەوێلە:** تەویلە، تەولە، تونێل، ناوچاوان، پڕنگە، هەماری گەنم و دانەوێڵە/ گەوڕی وڵاخ، جێگایەك بۆ حەوانەوەی وڵاغی یەكسم (ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ)/ ناوی گوندێكە لە هەورامانی لهۆن.

**تەیمان:** پەرچین، پەرژین.

**تۆمار:** یادداشت، نووسراوەی لوولدراو/ زەبتکردن، هەڵگرتنی دەنگ و ڕەنگ لە ئامێری تایبەت وەکوو شریت و مۆبایل و کۆمپیوتەر و...

**تیلمە:** لەتە قوماش، پارچە، تیزماڵك، پارچەیەکی باریك و کەم لە چەرم یان کووتاڵ.

**تیواز:** قومار، ڕیسك، ملپێوەنان، کاری مەترسیدار.

**تێر:** شوێنی بار، خورجین، جەواڵ.

**تێسکە:** تیزەی تفەنگ، کونی خوارەوەی تۆپ و تفەنگ کە لەوێوە ئاور دەدرێن. (جامگی تفەنگ)

**تێلا:** گۆپاڵ، تەیاخ، کوتەك، گورز.

# ج

**«جدار»:** جیدار، دیوار.

**جاجم:** مەوج، تەنراوێکی سفتی ڕەنگاوڕەنگی خورییە و بە دەست دەچنرێت و بەرهەمێکی خۆماڵی کوردییە.

**جامانە:** ئاغابانوو.

**جامباز:** ڕێبو، کڵاوفڕێن، کڵاوچی، ساختەچی، قۆڵبڕ، دەسبڕ، فێڵباز، کەڵەکچی، کەڵەکباز، دەغەڵباز، دەڵاڵی وڵاغ فرۆشتن.

**جامبازە:** چراخپا، جانبازە، چەپۆکانەکردن و بەرزکردنەوەی هەردوو دەستی ئەسپ و وشتر و...، سەما.

**جامخانە:** ویترین، نوانەر، شوێنی ڕانانی شتی فرۆشتن، جێگای هەڵگرتنی گوڵ و شتی جوان و ناوازە.

**جاندرمە:** پۆلیس.

**جانگ:** پێشەسەر، بانی مەڵاشوو.

**جاو:** جانگ/ جۆ، یەوێ.

**جزدان:** باخەڵ، کیسەی بەر باغەڵ، گیرفان.

**جزوبەن:** جزوبەند، سەحافی کتێب، بەرگتێگرتن، پەڕەچنی، ساغکردنەوەی کتێبی دڕاو.

**جسن:** جنس، نەژاد، ڕەسەن، بنەچەدار.

**جگەرسۆز:** خەمخۆر، دڵسۆز، سینەسۆ، دڵڕام، دلۆڤان، بەبەزەیی، هەڤسۆز.

**جلێتێن:** یاری چۆگان.

**جندە:** حیز، قەحبە.

**جوبە:** عەبا، جبە، جۆرە کەوایەکی پێشئاوەڵەی مەلایانە.

**جورایل:** جورەییل، جوبرەئیل

**جوو:** جوولەکە.

**جووتیار:** فەلا، وەرزێر، (کشاورز).

**جووز:** نەقیزە، بز، بووز، جووك، کلکەقنگێ، کلکەبزێ، دەسەژی.

**جوولەکە:** مووسایی، جوو، کەلیمی، شوێنکەوتووانی حەزرەتی مووسا.

**جەحێل:** جەهێل، لاو، جوان، تازە پێگەیشتوو، گەنج، جحێڵ، هەرزەکار.

**جەربەزە:** غیرەت، شەهامەت/ سەربزێو،

عاجوول، هاروهاج.

**جەردە:** دز، چەتە، ڕێگر، ماڵبڕ.

**جەزبە:** جەزمـە، حـاڵ، حاڵەتێکـی عیرفانـی پەیڕەوانی تەریقەت، سەمای سۆفی و دەروێش.

**جەلەب:** هەوسار، لەغاو، جڵەو، دەستەوسار، ئـەو پـەت و گوریسـەی کـە بـۆ ڕاگیرکردنی چوارپێ دەبەسترێ بە لغاویەوە.

**جەواڵ:** تێـڕ، لایەکـی تێـرك، خـەرار، هـۆر، خورجینـی گـەورە، جەنتـك، گواڵە، کیسـەی دەغڵی گەورە لە تەلیس گەورەتر.

**جەهێڵ:** جەحێل، جەهێل.

**جۆرك:** توورەکـە، توورەکە، باخڵە، تۆمەدان، تۆمەبەرە، خورجین، توورەکەی ئاڵف.

**جۆلا:** جیـلا، جوولـگ، شـاڵچن، تەونکـەر، هۆنەر، شاڵباف، بووزووکەر، پارچە ڕستن.

**جیاز:** پیتاکی بووك، ڕەهاڵ، وەردەك، ناوتێلانە، کەلوپەلی بووك.

**جیدار:** دیوار.

**جیکەنە:** تەشـی، لەتـەرێ، جیکنـە، دووك، ئامرازی ڕستن/ نائارام، بێئۆقرە.

## چ

**چاپلووس:** خۆڵتەکەر، کلەسووتە، کەسێ کە بـە زمانچەوری خەڵکـی هەڵدەخەڵەتێنێت و فریویان دەدات، ماستاوچییەتی، ڕیاکاری، دووڕوویی.

**چارۆکە:** چارەکە، چارشێوشان، کۆڵوانە، چەتفە، باشیل، لەنگەرگە، وێستگەی پاپۆڕ لە لێواری دەریا.

**چاکڵە:** چەڵەمـە، چەمـەرە، چەڵـەم، ئاڵقەی سەر قەیاسە.

**چاوەزار:** چـاوزار، چەوبـەرد، چەمەزەخـم، نووشـتەی چاوپیسـی/ ئـازار و زیانـێ کە لە چـاوی پیس و حەسـوودەوە بە کەسـێك یان شتێك دەگات.

**چرووك:** بەرچاوتەنگ.

**چلە:** چلێ، چل ڕۆژ دوای مردنی ڕووداوێکی باش یان خراپ/ بە گژ هەوا و هەوەسدا چوون، بۆ ماوەی چل ڕۆژ.

**چلەخانە:** شوێنی چلەکێشان.

**چڵێس:** نەوسـن، خـۆرا، زۆرخۆر، خۆشخۆر، ژەمەسوو، زگدڕاو، لەمەدڕیا.

**چما:** ئاخۆ، داخوا، مەگەر، مەگیر، دەنا/ بۆچی؟.

**چنچکان:** چیچکە، جۆرە دانیشـتنێکە بەسەر هەردوو پێوە.

**چورتم:** دەردەسـەر، نەگبەتـی، نەهامەتـی، بەڵا، دژواری.

**چەپەر:** چیغ.

**چەتفە:** چارۆکە، چەفتە، دەسماڵێکە لە ملی دەهاڵێنن

**چەتوون:** هاروهـاج، بـزۆز، تووترکەسـەر، جیوەتێکراو/ دژوار، ئەستەم.

**چەرچی:** دەرگێڵ، وردەواڵەفرۆش، دەسگێڕ، دەستفرۆش، مامڵەچی سەرپایی، گەڕیدە، حەتار، دیڤەرە، پێڵەوەر، کووتاڵفرۆش، کۆڵگێڕ.

**چەرخ:** دۆڵاب، ئامـرازی ئـاو دەرکێشـان لـە بیـر، گرگرە/ تایـەر، گرۆڤەر، هـەر ئامێرێکی خـڕ و شـایانی سـووڕان/ سـەردەم، ڕۆژگار، زەمانـە، چـاخ/ ئامێری تیژکردنـەوەی چەقۆ، فەنەك، چەخماخی جگـەرە و ئاورکردنەوە/ باڵندەیەکـی گەورەیـە وەکـوو داڵ، باڵەبان، باشە، واشە، باشوو، قوژ.

**چەرداوەڕوو:** بێحەیـا، ڕوودار، بێچاوڕوو، ڕووهەڵماڵراو، چەقەسوو.

**چەرمی چۆلەکە:** کینایـە لە نەبوونی جێگا و تەنگی و بچووکی شوێن.

**چەشە:** چەشـتە، چەشـکە، مەکەچـە/ چێـژ، تام، مێلاك، مەزە، تەبیعەت.

**چەقاوەسوو:** چەرداوەڕوو.

**چەقەڵ:** پاچکە، قاچوقول/ لەڕ، لاواز/ لووتکەی چیا کە بەسەر لایەکدا شۆڕ بووبێتەوە/ بزنی چەرمـووی مل ڕەش/ یەکێکە لـە گیانلەبەرە دڕندەکان.

**چەقەڵان:** لەچك، سەرپۆش، داپۆشەر، چارشێو، ئەوەی پرچ و لەشی ئافرەت دادەپۆشێ.

**چەکمەجە:** کەشاو.

**چەلەحانێ:** دەمەقـرە، دمەقاڵە، دەمەدەمە، مشتومڕ، مقۆمقۆ، چەنەبەچەنە.

**چەڵەمە:** ئاڵقـەی سـەر قەیاسـە، قوڵفەداری سەر گوریسی بار، چاکڵە، چاکڵ.

**چەڵەمەشکێنە:** چەڵەمەشکانێ، گرەو، جۆرە گرەوێکـە بـە چۆڵەمەی مریشـك دەیکەن و بێتو یەکێك شـتێك بداتە دەست ئەویتریان ئەبـێ بڵـێ «لەبیرمـە» ئەگـەر لەبیـری بچێ ئەوە ئەویان بردوویەتەوە.

**چەمەر:** کەوانە، ئاخڵە، پەپکە.

**چەمەری:** لاواندنەوەی مردوو، نوحە،

**چەمۆڵە:** چەمبۆڵـە، گەشـکە، گژکـە، پـووك، پووکاوڵە.

**چەو:** وردە بەرد، ڕمل، لم، زیخ، کوچك.

**چەوتوچەوێڵ:** لاروگێڕ، چەوتوچێڵ.

**چەوریەسان:** چەوری هەسان.

**چەولگ:** خیـزەلان، شـوێنێ کـە لـم و زیخی زۆر بێ.

**چەوەنەر:** چەوەندەر، چۆنەر، چوننەری.

**چەوێڵ:** چەوت، گێڕ، لار، ناڕاست.

**چۆقە:** چـۆق، چۆقان، لەرزوتا، تەقەی ددان لە کاتی سەرمادا، هەڵلەرزین، ڕکەرك.

**چیت:** قیژوهۆڕ/ پارچە تەنراویکی ڕەنگاوڕەنگی لۆکەیە و ژنان بۆ پۆشاك و جێوبان بەکاری دێنن.

**چیغ:** پەردەی دروسـتکراو لە زەل و قامیش، چەپەر، هەژگ، دیواری حەسیری.

**چیلکە:** چیکلە، چیلە، داری بچووك.

**چیمەنتۆ:** چەمەنتـۆ، سـیمان، سـواغ، کفت، کاگڵ، تەڕەماڵ، گڵەبان.

**چێر:** جیر، کێش‌ئاسا/ گا، مانگا، چێڵ، گوانداری کاوێژکەر و ئاڵفخۆر و دەستەمۆ/ زاڵ، سوار، باڵادەست/ ژێر، خوار.

## ح

**حاسی:** عاسی، یاخی، تاوانبار؛ گوناحبار.

**حسمەت (عصمت):** حەیا.

**حوجرە:** ژوور، بەرکەماڵ یان ژوورێکی تایبەت لە تەنیشـت مزگـەوت بۆ خوێندنـی فەقێ/ نووسینگە و دووکانی بازرگانەکان لەناو بازاڕدا.

**حوقنە:** دەستوور.

**حەد:** ئاسـت، ئەندازە، شایان، شیاو/ سنوور، ئەندازە، ڕادە.

**حەرد:** ئەرز، زەوی، زەمین.

**حەفتەبیجار:** جۆرێکـە لە ترشـیاتی ناوچەی بیجـاڕ کـە لـە کوردسـتان و ئێـران ناوبانگـی دەرکردووە.

**حەڵوا:** هەڵوا، هەلاو، ئاسیدە، چێشتی دۆشاو و ئارد و ڕۆن.

**حەوجۆش:** حەوتجـۆش، وەکـوو ئاسـن وایە بـەڵام تورتە، لوولێنـەی مەفرەق، جۆرێکە لە ئافتاوە دروستکراوە لە مسی زەرد، مەسینە.

**حەی:** حەد، (حەیان چییە: حەدیان چییە).

**حەیتە:** زل، زەبەلاح، ئەندامی نێرینە پیاو.
**حەیران:** هۆگر، شەیدا / شێوە ئاوازێکی گۆرانی کوردییە کە بە شیعر و پەخشان دەوترێت و تایبەتە بە ناوچەی هەولێر و موکریان.
**حەیش:** عەیش، ژیان، ڕابواردن، خۆشگوزەرانی.
**حیز:** جندە، سۆزانی، قووندەری، خراپەکار، ڕووسپی، قاحبە، داوێنپیس، گەنەکار.

# خ

**خاجە:** بازرگانی گەورە، خواجا، خواجە، بۆ ڕێزگرتن لە جوولەکە و فەلەکان بەکار دەهێنرێت.
**خانەخوێ:** خانەخوا، خاوەنماڵ، ئەو ماڵەی میوانی هەیە.
**ختووکە:** ختکە، ختیلە، ختێ، ختلێ، خدووکە، قدیلە، قانەقدیلکە، قدقدانك.
**خروو:** خورو، خورەك، خارشت، خورین، ئالۆش، کلاشە، ورنایش، کەندش، وریای.
**خشت:** کەرپووچ، لە پێداویستی کردنەوەی خانووبەرە کە لە گیراوەی قوڕی تایبەت و خاکی سوور ساز دەکرێ/ ڕەبەق، بە تەواوی، بێزیاد و کەم، تەخت/ زەرگ، جۆرێ نێزەی نووكتیژ/ خشتە، کلێشە، ماڵك، چوارخانە، خانەخانەی چوارگۆشە/ خر، خرولك، گردە.
**خشڵ:** خەمڵ، ڕازێنە، تیفتیفە، ئەوەی بۆ ڕازاندنەوە بەکاری دێنن، زەمبەر، شتێ کە مایەی جوانییە.
**خڵافان:** خافڵ بوون، خڵەفان، خەڵەتان، فریوخواردن.
**خلك:** خدر.
**خلە:** خدر، خەلیل.
**خوتە:** خوتەخوت، خرتوبۆڵە، بۆڵەبۆڵ، پرتەپرت.
**خودان:** خوا، ئەڵڵاهـ، خولا، خودا/ خاوەن، ساحێب.
**خورت:** قەوی، بەهێز، پڕزۆر، ئازا، بەبڕشت، بەقەوەت/ قەڵەو، زەبەلاح، دلێر، باهۆدار.
**خورج:** هەگبە، چەنتەی لە بەن چنراو، جەواڵی بچووك، خورجێن.
**خوژیلك:** خوشیلك، شۆتکیلە، شۆتیلە، گیایەکی کوێستانییە کە شیرەکەی بۆ ڕەوانی و دانانی کرم کەڵکی لێوەردەگیرێ.
**خوشمێ:** بەرخ، وەرە.
**خوشیلك:** خوژیلك.
**خولا:** خودا.
**خولە:** مەحموود.
**خوێیاوك:** خوێ و ئاو، ئاووخوێ.
**خەتەنە سووران:** خەتنەسیروو، نانی خەتەنە، بەزم و ئاهەنگ لەبەر سوننەتکردنی مناڵ.
**خەرسەك:** کلۆی گەورە.
**خەرف:** پیر، بەساڵاچوو/ خەرف، خەرفیو، خەرەفاو، کەمزەین.
**خەرقە:** باڵاپۆشی پیاوانی عیرفانی، کۆنە، بەرگی دڕاو، شڕۆڵ.
**خەرکانە:** زەردەجۆش، خەرکان، نەخۆشینێکی پێستییە وەکوو زەك و جۆشی تەڕ و وشك بە زۆری ئەدا لە ڕوخساری مناڵ و تا چەن ساڵێك بەردەوامە.
**خەرەك:** دەزگای پەموو ڕستن، ئامرازی لۆکە ڕێسی، چەرخی ڕستن.
**خەز:** چەوری/ حەریر/ حەیوانێ کە پێستەکەی بەقیمەتە.
**خەزێم:** لووتەوانە، نەزمی گۆرانییێکی کوردییە.
**خەسیس:** چرووك.
**خەشیم:** ناشی، تازەکار، ڕانەهاتوو، ناشارەزا.
**خەڵس:** خەلسان، لێبوونەوە، نەجات، ڕاحەتبوون، ئاسوودەبوون، خەلاس بوون.

**خەندەق:** خەنـدەك، كەنـەك، كۆزك، باهوو، ڕەهەند، كەندالّی هەڵكەنراو.

**خەیت (خَیط):** بەن، دەزوو.

**خۆن:** خۆمانە.

**خیزە:** لرخەی قورگ و سینە.

**خێل:** خوێـن، چاوخـوار، چاوگێـڕ، چـەملار، چەپوچیر، چاولار.

## د

**«دلائلُ الخَیرات»:** كتێبێكی ئایینییە كە بنەماكەی لەسەر چۆنیەتی سەڵواتدانە لەسەر پێغەمبەر.

**دارۆغە:** شارەوان.

**داسنی:** تایفەیەكی كوردن لە ناوچەی مووسڵ/ زەردەشتی/ خوازبێنیكەران.

**داڵەڕۆچكە:** داڵەرۆچكـە، داڵووچە، ئاوێزان، دالەقاو، شۆڕەوەبوو، هەڵاوێز.

**دامودەزگا:** دەمـودەزگا، بریتییە لە كەلوپەل و پێداویستی خانوبەرەی بەرز و بەشكۆ.

**دانامە:** تێگەیشـتوو، زانـا/ مـووی سـپی و ڕەشی سەر و ڕیش.

**دانسقە:** دیـار، بەرچـاو، هەڵكەوتـە، بژاردە، تاقانە، كەموێنە، بێهاوتا، تایبەت، دەگمەن.

**داوباز:** كەڵەكچی، فێڵباز، دەغەڵباز، گزەون، كەڵەكباز.

**دڕن:** بـۆدڕن، بۆنـی ناخـۆش، بۆنی حەچە و بەران، بۆنی ماسی،

**دروشكە:** كالیسكە.

**دزداشە:** لیباسی دەرەدامانی عەرەبی.

**دستەسڕ:** دەسـماڵ، دەسـرە، دەسـرۆكە، دەرچاڤ، كەفیە، دەسماڵی دەست.

**دسرازە:** دەسترازە، شریتێكی پان پانە لە خوری دروسـت دەكرێ بە نەخـش و ڕەنگاوڕەنگ، دەسـپێچەك، پێچەنـێ، بەن یا پـەت یا پەڕۆ و كـەژوو و پاڵانـی منـداڵ بەسـتێن لە لانك و بێشكەدا.

**دگان:** ددان، دیان، دران، دان.

**دوت:** كچ، كەنیشك، كناچێ.

**دوختۆر:** دوكتۆر.

**دووزەلە:** جووزەلە، تووتەك، ئامێرێكی بازەنی كوردییە.

**دەباخانە:** هەڵاڵخانە، دەباغخانە، خۆشەخانە، جێگەی دەباخدان، جێگەی خۆشەكردنی پێست و چەرم.

**دەبەنگ:** تێنەگەیشتوو، شاقێر، نەزان.

**دەخڵ:** دەخاڵەت.

**دەرۆزە:** سواڵكەر، گەدایی، خوازەڵۆكی.

**دەسانقەست:** بەتایبـە، لەقەسـت، لە ڕووی ئاگایی و زانیارییەوە، عەمدی.

**دەستوور:** بردنەوە ژووری ماددەی ڕەوانكەر لە ڕێگای كۆمەوە، شیاف، ئیمالە.

**دەستەبەر:** بارمتـە/ دابینكـردن، مسـۆگەر، بەدەستهێنان.

**دەستەمۆ:** دەساژۆ، خووگرتوو، ڕاهاتوو، ڕام، ملكەچ.

**دەستەوشار:** عەنتیكە، دێرینە.

**دەسخەڕۆ:** خڵافان.

**دەقنە:** ڕاتبـە، ڕاتـوو، كۆكردنـەوەی خۆراكی فەقێ.

**دەلوبیبەر:** بیبەری تیژ، فلفل، بیباری سەوزی دۆڵمە.

**دەلەسە:** درۆ، فڕوفیشـاڵ، شاتوشـووت، خۆهەڵكێشان، هاشە، پاخان.

**دەماخ:** كەیـف، وەشی.

**دەمودوو:** قسەڕەوانی، ڕەوانبێژی، ئاخاوتنی

ڕەوان، پەیڤ و گوتەی پاراو، هێزی دەربڕین.

**دەموفلق:** دەمولەوس، کۆی دەم و چەناکە و شەویلاك.

**دەمەقرە:** چەلەحانێ.

**دەهری:** لەجووج، لاسار، کەللەشەق، ڕقن، نەساز/ پێچەقێن، توورە/ لە دین دەرچوو، کەسێ حاشا لە بوونی خوا بکا.

**دەیسێ:** هەڵگیسراو، ڕۆشن.

**دۆشدامان:** دوشدامان، نارەحەت، مات، کز/ کلۆڵ، کارلێ نەهاتوو، چارەڕەش، داماو، داماگ.

**دۆکولیو:** دۆخەوا، دۆخوا، دانەدۆ، دوین، مەهیر، چێشتی دۆ و گیا و دانەوێڵە.

**دۆلگە:** دۆلکە، دەفر، پارچ، دۆڵچە.

**دۆم:** قەرەچ، قەرەچی، کۆچەر، ڕەوەند، خێلاتی، دوڕاجی، چۆڵپەرەست، هۆزێکی گەڕۆکن، کلاشکەر.

**دیرەك:** کۆڵەکە، ئەستوون، ستینك، پاژەر، ئەستوندەك.

**دیق:** سوێ، وەرهەم، خەم و خەفەتی زۆر.

**دیلماج:** وەرگێڕ، تەرجومان.

**دێڵەسەگ:** سەگی مێچکە، دەڵەتوتێ.

**دێمك:** کیسەی ئاو، خازی، قومقومە، مەتارەی ئاو.

**دێوجامە:** پەردەیەکی ڕەنگاوڕەنگی دروستکراوە بۆ کاتی ڕاوکردن.

ر

«**رأس**»: سەر، سەرە.

**ڕات:** بۆ تۆ.

**ڕاتبە:** دەقنە، یارمەتی و بەخشینی خەرجی بە فەقێ، دەرماڵە.

**ڕاتوو:** ڕاتبە.

**ڕاعی:** شوان.

**ڕامیاری:** سیاسی.

**ڕانك:** شەرواڵ، دەرپێ، پانتۆڵ، پاوارە، پانتۆڵی شاڵی، پاتۆڵی دروستکراو لە خوری و موو.

**ڕانکوچۆخە:** چۆخەوڕانك، جلوبەرگی کوردی دروستکراو لە مەرەز.

**ڕای:** بۆ.

**ڕایە:** شیاوی، شایستەبوون.

**ڕایەخ:** فەرش، دۆشەك، سفرە، بارگەوبنە، چێرەخەر.

**ڕبە:** ئەندازەیەکی دیاریکراوە بۆ پێوانی دانەوێڵە (وەکوو: تەغار، وەزنە، مەن، کەوێژ، کەوچ) کە ئەکاتە شەش مست.

**ڕشاندن:** ڕژاندن، ڕژتن، ڕێتن، متەی، ڕژانی شلەمەنی وەکوو ئاو.

**ڕمبە:** دەنگی دهۆڵ لە دوورەوە، دەنگی داکەوتنی شتێکی قورس لە شوێنی بەرزەوە، زرینگە، گرمە.

**ڕمووزن:** دێو، درنج، شەیتان، ئەهریمەن، بوونەوەرێکی ناقۆلا و زەبەلاحی ئەفسانەیی و خەیاڵی ترسێنەرە کە لە ئینسان دەچێ.

**ڕووپیە:** یەکەی دراوی وڵاتی هیندستان.

**ڕووتوقووت:** ڕووتی مادەرزادی، پەتی، خواس، سەڵتوقوڵت/ نەدار، بێماڵوحاڵ، لانەواز، ڕووتوڕەجاڵ.

**ڕەچەڵەك:** ڕەتەوە، نیاك، بنچینە، ڕەسەن، بنەچە، ڕەگەز، بنج و بناوان.

**ڕەدو:** ڕاوەدوونان، هەڵگرتن، ڕاونان، تاڕان، ڕاماڵین. (فراری دادن)

**ڕەز:** باخ، باخەمێو، داری ترێ.

**ڕەسوو:** ڕەسوول.

**ڕەشتی:** مشکی، مشکیە، شەدە، سەرپێچ، سەروێن.

**ڕەشکە:** تۆڕی ئالف کێشان، سیاوڵە.

**ڕەشماڵ:** خێوەت، سیاماڵ، دەوار، چادر..

**ڕەشمە:** هەوسار، هۆسار، هەفسار، دەسکەوسار، جڵەو، پاڵەنگ.

**ڕەقیتە:** هەڵوێسانی لاشەی مرۆڤ لە کاتی سەرمادا/ ئازارێکی دەمارییە لە بەشی خوارەوەی پشت دەست پێئەکات، پشتئێشان.

**ڕەماڵ:** لاوی فەقیرحاڵ، شێتۆکە.

**ڕەند:** لاوچاک، جوانچاک، جوانمەرد، جوامێر.

**ڕەو:** دەرچوون، سڵەمە، قوشقی بوون، ڕاکردن لە ترسا.

**ڕەوەن:** کۆچەری، ڕەوەند، چۆڵنشین، تاوڵنشین، خێوەتنشین، خێڵەکی.

**ڕەهەن:** ڕەهەند، زێراب، فازڵاو، ئەیاغ، ئاوەڕۆ، ڕەهەندی ئاوی پیس/ ڕوانگە، چاوەنیا، گۆشەنیگا، لایەن.

**ڕەهێڵە:** تاو، تاوەباران/ خوێنبەر، سوورەمار.

**ڕۆخ:** قەراخ، کەشار، لێوار، گوێچەم، زەوی نزیك دەریا.

**ڕۆژهەڵات:** خۆرهەڵات، شەرق، وەرکەوت.

**ڕۆژئاوا:** خۆرنشین، غەرب، وەرپەڕ.

**ڕۆمانتیك:** شتێك کە سۆز و خەیاڵ زاڵ بێ یان بیانورووژێنێ، شاعیرانە، ئاشقانە، خەوناوی/ پێچەوانەی کلاسیك.

**ڕیشخەن:** گاڵتە، قەشمەری، تیتاڵی، تەوزە کردن.

**ڕیشوو:** ڕیشۆك، گوڵنگ، گوڵەنگ، گوڵینگە، گۆفەك، مەندۆڵە.

**ڕیگ:** ڕەمڵ، قووم، لم، زیخی زۆر ورد، سیلك.

**ڕێس:** ڕێسراو، هەودا، تاڵ، بەن، پێگەییو/ ستوور، قەبە، زل/ پاشبەندی بۆ ڕستن وەکوو: خوریڕێس، پەمووڕێس.

**ڕێوەڵە:** ڕیوەڵە، کز و لەڕ، ڕەقەڵە.

**زاخاو:** سیقاڵ، مشتوماڵ/ برقان، پەرداخ/ لێکردنەوەی ژەنگ و چڵك/ ساف و ڕێکوپێك کردن/ زێڕوێنە، زێڕکوت، جوانکاری/ خەمبارکردن، زوخاودانەوە.

## ز

**زار:** دەم، ناوی دەم.

**زاوت:** گزیر، سوورباش، سەرکار، کوێخا، کاربەدەستی خان و ئاغا.

**زت:** زیت، قیت، قوت، زەق، ڕەپ، بەرچاو/ دژ، زد، پێچەوانە/ یاری ناو لم و زیخ/ ڕووتوقووت.

**زڕ:** نائەسڵ، بەدەڵ، داری بێبەر.

**زراو:** بوێری، (شجاعت)

**زرت:** وریا، زیت، زرتوزینگ، زیرەك، زیتەڵە، گورجوگۆڵ، بەدەستوبرد.

**زرتە، زرتەبۆز:** زەبەلاح، فیلەتەن، زرتەبۆر، زلحۆ، نابار، ناکڵۆکار.

**زرکە:** گرکە، کاڵەك.

**زکماك:** زگماك، هەر بەوجۆرە لەدایك بووە/ خەسڵەت و تایبەتمەندی کە لە کاتی لەدایكبوونەوە بووبێ.

**زڵزڵە:** زەڵزەڵە، چڵکی زەخم، کیم، زووخاو، هەوا، کێماو.

**زندیق:** بێدین.

**زوخاڵ:** خەڵووز، ڕەژوو، سوخاڵ.

**زوورە:** حیلەی ئەسپ، کۆڕژن، شیبە.

**زەبتیە:** زەفتیە، عەسکەر، سەرباز، پۆلیسی شاری.

**زەبروزەنگ:** پابەند لەسەر بڕیار (قاطعیت در حکم)، ڕەوتی دەمکوت کردن و چەپاندن/ توندوتیژی و قەڵسی لە قسەکردن و کرداردا.

**زەبەلاح:** زلحۆ، زل، زرت، زرتەبۆر.

**زەڕە:** سەڕە، زەڕەزەڕ، سەڕەسەڕ/ دەنگی گوێدرێژ.

**زەریبە:** باج، باربوو، سەرانە، پیتاك، ماڵیات، کەلەپوور، باژ، قەرەبوو، جەریمە.

**زەمیلە:** چنگڵە، زەنبیل، کەرتەلە، دەسکلە، گۆشەر.

**زەنەق:** وره، هێزی دڵ، هەناو، زراو، غیرەت.

**زیچکاو:** زلزلە، زەرداوی برین.

**زیرگن:** پیس، چلکن، ڕیقن، چەپەڵ.

**زیق:** زیرە، زیقە، زریکە، دەنگی گریانی منداڵ، قیژە، قیرە، جیرە، دەنگی تیژ و ناخۆش و ئازاردەر.

**زیقاوڵە:** زیقاولە، ماسیگرە، مەلێکی لاق کورتی کلك درێژی دەندووك چەماوەیە و بە زۆری بە کۆمەڵ ڕاوی ماسی ئەکەن.

**زیندروو:** زیندوور، ئەوەی زینی ئەسپ و وڵاخ ئەدوورێ.

**زێراب:** فازڵاو، ڕەهەن.

## ژ

**ژیشك:** ژیژوو؛ ژیژك، ژووژوو، ژیژۆ، ژژووك، گیانداریکی دڕکاوییە.

**ژیکەڵە:** جوانکەلە، خاوەنی جەستە و ئەندامی ورد و ناسك، خنجیلانە، لەبەردڵان، خوێنشیرین، نازدار، جوانکیلانە.

**ژێرچنە، ژێرچەنە:** بەربەنە، چێرچەناکە، ڕشتەی مووروو کە ژنان لە ملی دەکەن لەگەڵ کڵاوزەڕ.

## س

**ساجی عەلی:** کەوتنە سەر ساجی عەلی: تووشی ڕەنج و سەختی زۆر بوون، تێشکاو، نەدار و بێپووڵ بوون، زۆر دەسکورت بوون، لەسەر سفر خولانەوە.

**ساوەر:** ساوار ، پەتڵە، گەنمی کوڵاوی ورد کراو، بروێش، برێش.

**سایەن قەڵا:** شایەن قەڵا، شاهینقەڵا، شاری شاهیندژ لە ئازەربایجانی خۆرئاوای ئێران.

**سپڵۆت:** سەگ، سەی، تووتە.

**ستار:** ئاسوودەیی، ئۆقرە، هێوری، ئۆخژن، هێمنایەتی، سوکنا، سرەوت.

**سڕ:** تەزیو، لە گۆچوو، گۆنەکەر/ ڕاز، نهێنی، ڕەمزوڕاز.

**سرکاندن:** بە ئەسپایی، ئارام، لە ژێر لچەوە قسەکردن، چپە، سرتە، قسەی بناگوێ، فسە.

**سرووش:** وەحی، نیگا، پەیام.

**سمڕ:** حەلەلا، هەراوزەنا، زەنارزەنار، قاڵ، گۆڵمەز، ژلیوە، چەقەچەق، هەراوهوریا، گاڵەگاڵ.

**سندان:** سنان، سننان، دەردی بێدەرمان، دڵەدەرد، جۆرێکە لە جوێندان/ ژەقنەمووت، قوزەڵقورت، لە وەڵام و بێزاری بە قسە، پێکەنین یا گریانی نابەجێی کەسێك دەوترێ.

**سنگ:** سینە، بزماری قەوی، پسماری.

**سننان:** جۆرە نەخۆشینێکە، ماسینی بنهەنگل، سنان، شێرپەنجە، قرژە، کورنجە، سیەسنان، سەرەتان.

**سواخ، سواغ، سواق:** سیواغ، ئەناو، کاگڵ، چیمەنتۆ، تەرەماڵ، قورەکاری، پیاساوین، هەڵسوان، ناوین.

**سواو:** سەواب، پاداش/ ساویاو، سوویا، ساف و لووس بوو لەبەر کاری زۆر، کون کراو/ ڕزاو، پرتووکاو، پوویا، وڵەنتەر، شڕوشیتاڵ بوو، پواو.

**سوخته (سووخته):** فەقێی تازەخوێن و کەمخوێن، فەقێی پلەخوار و خوارتر لە موستەعید.

**سوڕ، سووڕ:** سڕ، ڕاز/ ڕاکێشەر، دڵبەری/ گەڕان، دەوران، سووڕ/ حەپەساو، واقوڕماو، کڕومات، هیت.

**سوڕمان:** سووڕمان، ڕامان، حەپەسان، وڕ مان، مات بوون، سەر سوڕمان.

**سونگر:** سونقوڕ شارێکی پارێزگای کرماشانە (سنقر).

**سووچ:** تاوان، هەڵە، کەتن، خەتا، گوناح، سەرپێچی.

**سووڕمان:** سوڕمان.

**سووژن:** سنگ، شووژن، سووزن، گوندووش، دەرزی درێژ و ئەستوور بۆ جەواڵ دروون.

**سوین:** ساین، ساوین، سواندن، ساوای، پێداخشان، لێخستن/ کونکردن، سماندن، سمین.

**سوێن:** سوێند، سۆند، سۆکەند/ تەشت، کاسەی گەورە، دیگ.

**سەبیل:** سەویل، سەبیلە، ئامرازی تووتن کێشان، دەمنە/ ئاوێك کە بە خۆڕایی لە ڕێی خوادا ئەیدەن بە کەسێك.

**سەپان:** شوان.

**سەدارە:** جۆرێکە لە کڵاو.

**سەراو:** سەرچاوە، سەرچاوگە، سەرچەمە، چاوانە/ تراویلکە، لەیلان، ڕەورەوەك، هاڵ، ڕمڵ و زیخێ کە لەبەر تاو لە دوورەوە دەترووسکێ و وەك ئاو دیاری ئەدا و پێت وایە ئاوە و ئاویش نییە.

**سەربزێو:** هاروهاج، سەرکێش، چەتوون.

**سەرپشك:** خاوەن ئیختیار، سەربەست/ خاترانە، مافی تایبەتی.

**سەرقەڵەمانە:** حەقی دۆعا خوێندن و نووشتەنووسین.

**سەروپێچ:** جامانە.

**سەروگوێلاك:** سەروپۆتەلاك، قیافە، سەروسیما.

**سەرەبزووت:** کۆڵەوەژ، بزووت، سووتۆك، کڕکر، سووتەڵ.

**سەرەتاتکێ:** قوتەقوت، تخوولی، خۆتێهەڵقولتان، فزوولی، بە دزییەوە سەیرکردن.

**سەرەتەقێ:** سەرەتەقە، ئاگایی و ئەزموون، سەررشتە، لە کار زانین.

**سەرەنوێلك:** سەلوێنك، جێگەی هەڵڕژاندنی پەیین و سەنێر و لاسی ئاژەڵ.

**سەفەربەرلك:** سەفەربەلگ، عرووس، شەڕی جیهانی، ئامادەیی گشتی بۆ بەرەکانێی شەڕ.

**سەقاقوش:** پەلەوەری ماسی خۆر، ماسیگرە، پلیکان، بەرچێڵەی شۆڕە و ماسی و ئاوی تێدا ئەمبار دەکات..

**سەکوە:** سەروسیما.

**سەگبەحەسار:** کوتەککاری، داوا و شەڕ.

**سەماع:** گوێگرتن لە دەرزی فەقێ.

**سەوت:** دەنگ.

**سەی:** ڕاو، سەید، لە داو خستن یان کوشتنی گیاندار کێوی/ سەگ، سپڵۆت.

**سەی:** سەید، سەیید، ئەوەی لە بەرەی پێغەمبەری ئیسلام بێت/ سێبەر، سێوەر.

**سیان:** عەشیرەتیکی کوردن.

**سیاوچەمانە:** گۆرانی تایبەت بە ناوچەی هەورامان.

**سیپاڵ:** کۆنەپـەڕۆ، شڕوشـیتاڵ؛ بـەڕ، پەڵاس، گڵێم، پەڕۆشڕە.

**سیچکە:** یەکێ لە بەرەکانی داری مازووداره/ ئەووەڵین خونچەی دار.

**سیچکەسڵاو:** قنچکەسـڵاو/ زیپکەیەکـە لـە لێواری چاو دەردێ.

**سیرێژ:** کەشك، لوف، سیراج، چۆرتان.

**سیل:** نەخۆشی سل.

**سێتە:** کێو، کەژ، کۆ/ گوریسی سێلا، فرێت، تێوەدانی تەون، تانوپۆ.

**سێدەری:** پەنجەرە.

**سێرە:** سـیپە، قەرەوڵ/ قوتکەی سەر لوولەی تفەنـگ (مگسـك)، نیشـانە/ تیـرە، مـاوەی ژیانی کەسێك/ پەلەوەرێکی بچووکی جوانە.

**سێیەك:** لە سێ بەش بەشێکی، (یك سوم).

# ش

**«شَفتَین»:** دوو لێو.

**شاپلێتە:** چراولە، چۆڵەچرا، چلووسك، مەشعەڵ، مەشخەڵ.

**شاتاڵ:** خرتوپـرت، شڕوشـاتاڵ، وردەپیتـاك، شەنگەشڕە، کەلوپەلی کۆن و شڕ، ورتکەوپرتکە.

**شایلۆغان:** زەماوەند، گۆڤەند.

**شایەت:** شـاهێد، چـاوەر، شـادە، چاوەنیـا، گەواهـ، ئاگادار لە ڕووداو.

**شریخوهۆڕ:** دەنگی لێکدانی شمشێر، گرمە بەشوێن یەکا/ گرمەی هەور.

**شریخە:** نەڕاندن، دەنگی بەرزی هەورەتریشقە/ دەنگی بەرز و کتوپڕ.

**شکارتە:** جووتیـاری بـۆ هـەژاران لـە ڕێـی خوادا بۆ ئیحسان، شقارتە، شەمچە.

**شلوکوت:** بێگیـان، ناتـەوان، زۆر مانـدوو، کەنەفت.

**شوانکارە:** ئاژەڵدار، مەڵات بەخێوکەر، چێوار، چۆڤار، تیرەیەکی کۆنی کوردن.

**شووش:** باریـك و ڕەعنـا، ئەندامی ڕێکوپێك و جوان.

**شووشە:** شیشە، کاسەی شیشەیی، جام.

**شوێنەونی:** ڕێگوم‌کردن، جێ‌پێ نەهێشتن؛ خۆ دزینەوە.

**شەپەزللە:** زللـەی تونـد و بەژان، شـەقەزلە، شەپلاخە، شەپلاغە.

**شەتەك:** بەستن،داخستن، هەڵپێکان، پێوەدان، ژەنای، گرێدان، قەپات‌کردن، قوڵف‌کردن.

**شەختە:** سەرمای پاییز، سەهۆڵبەندان.

**شەربە:** کاسەی گڵێنە.

**شەلاخ:** شەللاق، قامچی، جەڵدە.

**شەمەندەفەر:** شەمەنەفەر، قەتار.

**شەنگەسوورە:** سۆرەمز، سوورپیاز، سیرەمۆزە، مێروویەکی بەچزووە لە زەرتگە (زەردەواڵە) گەورەترە.

**شەنوبا:** شـەنکردن، پاککـردن، شـەن‌وکەو، تاوتوێ، تەتەڵە، بووجاڕی، پاککردنی گەنم و دانەوێڵە بە با و کەو/ شرۆڤە، باس و لێدوان.

**شەوچەرە:** باسی خەڵك بە خراپی و سەرزەنش کردن لە شەونشینیدا / شەوچەلە، خواردنێ کە لە شـەوبێری دەخورێ/ خواردنی وشکەبار لە میوانیدا بەتایبەت شەوانی پاییز و زستان/ میوەی وشك‌کراو وەك: مێوژ، قەیسی، سێو و توو...

**شەهادە:** بڕوانامە/ بەڵگەی زانستی و خولی فێرکاری.

**شەهید:** ئەوەی لە ڕێی خوادا کوژرابێ.

**شۆڕشگێڕ:** شۆڕشـڤان، لایەنگـری شـۆڕش، خەباتگێـڕ، خەباتـکار، تێکۆشـەر، خوازیاری

گۆڕانکاری بە قازانجی کۆمەڵگا و گەل و نیشتمان.

**شۆڕەسوار:** تاکەسوار، سووکەڵەسوار، سوارچاک، لێهاتوو لە سوارکاری و ئەسپ تاوداندا.

**شیر:** شمشێر، خنجەر/ شیری خواردن.

**شین‌وشەپۆڕ:** شیوەنی دەستەیی پێکەوە.

**شیو:** شێو.

**شێخ:** سەرناوی زانایانی ئایینی، ڕێنوێن، پیری تەریقەت.

**شێرگیر:** ڕاوکەری شێر/ پێداگر، سوور لەسەر مەبەست.

**شێو:** چێشتی کوڵاو، ژەمی ئێوارە.

# ع

**«عَضرَفوط»:** مارمیلکە، کەشکەسەرە، قومقومە.

**عانە:** یەکەی پووڵی وڵاتی هیندستان، وردەپارەی کەم.

**عرووس:** سەفەربەلگ، شەڕی جیهانی، ئامادەیی گشتی بۆ بەرەکانێی شەڕ.

**عەجەم:** غەیری عەرەب، لە کوردستاندا بە غەیری کوردیش دەوترێ، فارس.

**عەرەو:** عەرەب.

**عەقرەو:** عەقرەب، دووپشك، مارەکۆڵ، کڵاژدم، چزەپێڵە.

**فەلە:** گاور،خاچپەرست، عیسایی، مەسیحی.

**عەقید:** ئەفسەر، فەرماندە.

**عەلاف:** سەرگەردان، وێڵ، وەیلان/ ئالف‌فرۆش، دەخڵ‌فرۆش.

**عەلافخانە:** شوێنی کڕین و فرۆشتنی دەغڵودان، شوینی سەودا و مامەڵەی دانەوێڵە.

**عەلە:** عەلی.

**عەنتەر:** ئەنتەر، قوونسوور، جۆرێکە لە مەیموون/ جنێوێکە لە کاتی تووڕەبووندا دەوترێ بە کەسی بەرانبەر.

**عەنعەنە:** دەبدەبە، دەسوپێوەند، دەسوپەیمان/ خۆنوێن، شان‌وشکۆ، تەنتەنە، جەلال‌وشکۆ.

**عەوڵا:** «عبدالله».

**عەیام، (ایام):** ڕۆژەکان.

**عیمالە (إمالە):** دەستوور، حوقنە، شیاف.

**عێل:** خێڵ، ئێڵ، ئێل، تایفە، هۆز، عەشیرە، تیرە، کۆمەڵە ڕەوەندێك پێکەوە، گرووپ، دەستە.

# غ

**غیلمان:** خزمەتگوزارانی بەهەشت، خوڵامەکانی بەهەشت کە لە جوانیدا وێنەیان نییە.

# ف

**فانۆز:** فانۆس، چرا، لامپا، چراوی، ڕووناکیدەر لە تاریکی، شەماڵە.

**فرتوفێڵ:** مەکر و حیلە، گزی، فریو، گەڕ، فێڵ و تەڵەکە.

**فشە:** گاڵتە، گەمە/ بێ‌نرخ، خۆهەڵکێشان/ ناوی پەلەوەرێکە.

**فلس:** یەکەی پووڵی عەرەبەکان.

**فنش:** کۆتایی، تەواو، ئاخر.

**فوکول:** زوڵف، قژ، ئەگریجە، بسك، کەزی، پووپڵاك.

**فەتەڕات:** خەسار، مزەڕەت، بەڵا، تەگەرە، بەسەرهاتی ناخۆش، زەرەر، ئازار، وەیشوومە، قەزا، هەر ڕووداوێکی ناخۆش و زیانبار وەك: شەڕ، بوومەلەرزە و لافاو و نەخۆشی.

**فەخفووری:** جۆرێ سواڵەتی هەرەباش، دەفر و قاپی چینی، فەغفوور نازناوی شاهانی چینە.

**فەر:** فەرد.

**فەرەنگ:** ئورووپا، ئەورووپایی.

**فەزیعەت:** فەزیحەت، ئابڕووتکاوی/ قسەی ناحەز و بێئەدەبانە.

**فەساڵ:** بیچم، بەچك، بەژنوباڵا، لەشولار، قیافە، سیما، دیمەن، شکڵ.

**فەقێ:** ئەو کەسەی خەریکی خوێندنی زانستی ئایینی و شەرع و قورئانە، قورتابی دینی لە حوجرە.

**فەلا:** جووتیار.

**فەوق:** ژوور.

**فۆلکلۆر:** فولکلۆر، دابونەریت، زمان، هونەر، ئەدەبیات و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان/ فەرهەنگی گەل.

**فیتە:** وێڵ، دەشتەکی، کەمعەقڵ، بێسەواد.

**فیچقە:** فوارە، فیشکە، جۆشان، هەڵچوون، قوڵقوڵە، بەتەوژم، کفارە، فیشقەی ئاو لە زەوی.

**فیرنەگولە:** فڕنەگولە، باڵندەیەکی بچووکی پڕ جموجوولە بە دەنووکی باریکەوە کە پەڕوباڵی زووزوو ڕەنگ ئەگۆڕێ.

**فیشەك:** گوللە، تیر.

**فیشەکەشێتە:** گولەی وێڵ، فیشەك هەڵدان لە جێژن و خۆشیدا، یاریکردن بە ئاگر.

**فێست، فێست:** جۆرێکە لە کڵاوی ژنان و پیاوان بە زۆری لە تورکیە و عەرەبنشینەکان.

## ق

**قاپقاپ:** جۆرە پاپۆش و پێڵاوێکە لە دار دروست ئەکرێ.

**قاپوقاچاخ:** دەفر، کاسەوکەوێڵ، کاسەوکەوچك، پێداویستی ماڵ.

**قاپووت:** پاڵتۆ، فەرەجی، تاتکی.

**قاپی:** دەروازە، دەرگا، بەرە.

**قاپیوان:** دەرگەوان.

**قازانقایە:** ناوچەی قەرەداغ.

**قاسە:** قفڵ، قوڵف، کۆج، کلیل، کڵۆم، کەسەك/ سندووقی هەڵگرتنی شتی بەنرخ، گاوسنۆق/ کورتکراوەی ناوی قاسم.

**قاش:** قاژ، کووز، خاش، چینە.

**قاف:** قاپێلکەسەر، کەللەسەر، کاژەڕە، کاپۆڵك، سۆنکە، هەڵکەوت.

**قاڵدرمە:** پلیکان، پلەکان، پەیژە، پەینجە، پەیجە.

**قامیش:** نەی، لەبان، قەمیش، زەل.

**قاوت:** قاویت، چەن دانەوێڵەیەك ئەهاڕن و ئاردەکەیان تێکەڵ ئەکەن پێی ئەڵێن: قاویت کە بۆ چەند دەرد و ئازار و نەخۆشی بەسوودە.

**قاورمە:** خۆراکێکە لە گۆشت دروست ئەکرێ لەسەر ساج.

**قاوەت، قاوەڵتی:** چاشتنگا، ژەمی پێش نیوەڕۆ و دوای بەیانی، قاوەتوون، چێشتەنگاو، بەرقلیان، تێشت.

**قائیمقام (قائم مقام):** جێنشینی پارێزگار، فەرمانداری، ڕاژۆر، دەسەڵاتداری شار کە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە کاروباری شاری پێدەسپێررێ.

**قڕ:** مەرگ و نەمانی گشتگیر/ سیخوار، ئاڵشت، زوقم، گرسانی شەونم لە کەشوهەوای سارددا/ بێدەنگ/ ناز، ئاینوئۆین، خەمزە.

**قڕان:** قەڕان، یەکەی پووڵێك، قڕ، مەرگ و نەمانی گشتگیر.

**قرچە:** دەنگی وێك کەوتنی ئاو یان ڕۆن لەگەڵ ئاور یان شتی داغ وەك ئاسنی سوورەوەبوو/ دەنگی تڵیشان یا درزبردنی بەرد و چێو/ چز، چزە/ گەرماوگەرم/ کڵۆش، ساقەی گەنم.

**قرۆش:** یەکەی وردە پووڵی تورکی.

**قسن:** مەزار، بینایەك لەسەر گۆڕ/ گۆڕی پیاوچاکان، نەزرگە، زیارەتگە/ کڵکۆ، شەخس/ دیواری بەردینی گرد.

**قڵپاندن:** ئاو ڕژاندن.

**قنچك:** ساقەتی باریکی میوە، قونچك/ تیکە، لەت، کوت، کەمێك لە شت/ جۆش و زەکی سەر پێست.

**قنسوولخانە:** نوێنەرایەتی سیاسی وڵاتێك لە وڵاتێکیتردا.

**قنگڵاشك:** ڕوەکێکە باڵای زیاتر لە یەك میترە و غونچەکانی پانە و لە نێویدا شتێکی وەکوو پەموو هەیە لە بنەماڵەی کنگرە بەڵام کنگر نییە.

**قورقوشم:** کانزایەکی نەرم و سپییە، سرپ، سرب، لەحیم، قەڵایی.

**قول:** قولانج، مەودای نێوان پەنجە گەورە و قامکی شادە/ بەردە، کۆیلە، بەندە/ کون، وڵە.

**قوڵاخ:** قوڵاخە، قوڵاغ، وشیار، گوێبەقوڵاخ/ جێگەی ئاو دابەشکردن لە مەرەزە/ بەڵگەی شتی گومبوو.

**قوڵاخە:** کۆبوونەوەی ماسی بە دەوری یەکەوە لە خزگە یا لە زستاندا، پینەی لێواری پێڵاو/ سەردەرکەوتنی ڕێبوار لە ئاسۆوە.

**قومار:** بازی بۆ ڕابواردن، یاری لەسەر پارە و شت بردنەوە، قسەی بە گەمە/ کایە، یاری، گەپ.

**قومیسەر:** سەربازڕەس.

**قوندەرە:** قۆندەرە، قۆنەرە، شبرەو.

**قووچەبڵباس:** ناوی گوندێکە.

**قووڕە:** قۆڕەی زگ/ قووڕەی سەگ.

**قووندەر:** قنگدەر، کوونی، کووندەر، حیز.

**قەپ:** گاز بە ددان.

**قەتیز:** داماو.

**قەرسیل:** پێشاخوڕ، ساقەی ئاڵف.

**قەرەچ:** قەرەچ، قەرەچی.

**قەرەچناغ، قەرەچەناخ:** کەسێ قسەی فرە ئەکا، وڕاج، چەنەباز، زۆربڵێ، درێژدادڕ، زماندرێژ.

**قەزاز:** حەریرفرۆش، هەورێشمفرۆش/ مەقام و ئاهەنگێکی گۆرانی کوردییە/ زەنگیانەهۆن

**قەزاوەگێڕ:** بەڵاگێڕ، بەڵاگەردان، سەرگەرد.

**قەشە:** ئۆسقۆف، ڕووحانی مەسیحی، پیاوی ئایینیی خاچپەرستان.

**قەف:** جێگەی گوڵ لێدەرهاتنی خەلە/ گرێ و بەندی قامیش و حەیزەران/ کەمەی گۆچان، چەمەرە، ئاڵقەی بەن و گوریس، چەڵەمە/ ئەشکەوت/ پەناگا/ گاشەبەردی زل لە چیا.

**قەڵادوشکان:** قەڵادووشان، قەدۆش، ناوشان، پشتمل.

**قەڵخانی:** هۆزێکی گەورەی کوردە.

**قەڵەمباز:** بازدان، خۆ هەڵدان، فڕ، خێز، قەڵباز، سنگەوباز، هەڵەڕان، تەکانی بەتەوژم.

**قەڵەمبڕ:** چەقۆ، تەور، خەنجەر.

**قەلەندەر:** کەپرسەوز، ماڵ لە کۆڵ، بێدەرەتان.

**قەنارە:** داری سێدارە/ چنگەکی قەساب کە گۆشتی پێدا دەکات.

**قەندە، قەننە = قەنە:** سەبیلی کلك درێژ، قلیان، دەمنە، سەبیل، قلیان ئاوی، نێرگەلە/ ولەرە، ولێرە، گیایێکە لە تیرەی نۆك و باقلە.

**قەنەفە:** موبل، شوێنی بەرزتر لە زەوی، دروستکراوی تەختە بۆ خەوتن و دانیشتن، قورسی درێژ.

**قەواڵە:** قەواڵەیی/ تاپۆی ملك، قەباڵە/ قەبارە.

**قەوان:** سەفحەی گرامافۆن.

**قەوە:** زۆر، هێز، نیروو، توانا.

**قەیسەری:** گوزەر، ڕاستەبازاڕ، بازاڕی گەورە و دالانەکانی، بازاڕی سەرداپۆشراو، پاساژ.

**قەیفە:** قەدیفە، پارچەی مەخمەڵ/ ناوی گوڵێکە/ خاولی گەرماو و حەمام.

**قۆپیە:** فێڵ، وەڵامدانەوەی پرسیاری تاقیکاری لە ڕووی کەسێکیتر یان لە ڕووی نووسراوە و کتێب و بە دزی. (تقلب در امتحان).

**قۆچان:** قەباڵەی ماڵ، تاپۆی مڵك، بنچاخ/ باجێکە ساڵانە لە ڕەعیەت ئەسێنرێ.

**قۆچ‌خان:** ناوی کەسێکە.

**قۆچەقانی:** قەڵماسك، بەردەقانی، کەلاسینگ.

**قۆرخ:** دەست بەسەردا گرتن، پەرچین‌کردنی زەوی، بردان، لاخستن، شاردنەوەی پێداویستی بۆ کاتی گران بوون.

**قۆریە:** مەڵۆ گیای گەورە، باقە گیای لەسەریەك چناو/ چادانی سەماوەر.

**قۆز:** قەشەنگ، جوان، لۆکس، ناسك، نەرمونیان، ڕێك و لەبار، تەڕزین/ چەماو، چەمیو، کووڕ، کۆم/ خوارەوەبوو.

**قۆشمە:** بزێو، زیرەك و فێڵباز/ نوکتەباز، گاڵتەچی.

**قۆشە:** شووم، نان‌ودۆبڕ، بێ‌فەڕ، نگریس، ناپیرۆز/ پوول، پووڵی کەم، فەتالی، فلس، قرووش، شایی.

**قۆڵچماخ:** قۆڵچماغ، قەرەچەناخ، زمان‌پیس، دەم‌هەراش (شارلاتان).

**قۆڵچی:** پیاوی دارۆغە، پۆلیسی ناو شار.

**قۆناخ:** ماڵی زۆر بەمیوان/ بابۆڵەی منالی ساواپێچ/ ڕووداوی مێژوو/ یەك ڕۆژە ڕێ/ قۆنداخی تفەنگ.

**قۆناغ:** مەرحەلە، زەمان، کات.

**قۆندەرە:** پێڵاوی پاژنەدار، قۆنەرە/ هەڵبەزینەوەی ئاو لە نێرینەی چەمدا.

**قیر:** بێدەنگ، سووك و ڕەحەت/ چوارنالە/ دەنگی مریشك لە ترسان.

**قیروسیا:** بە توون و تەوەس، بە جەحەنم، بە دەرەك، هەرچی ئەبێ با ببێ.

**قیژوهۆڕ:** گریان و هەرا.

**قیسپ:** دارێکە بۆ پەرژین دەچەقێنرێ، قسپ.

## ك

**کارەبا:** بەرق.

**کاشکی:** بریا، خۆزگە، خۆزگایێ، خۆزی، خۆزیا، کاشکا، کاشکای، شەڵای.

**کافرمان:** تیخ و چەقۆی تیژی موو تاشین/ گورزان، گوێزان، مووس، گیزان، تیکی موو تاشین.

**کاکەیی:** تیرەیەکی کوردن کە ئاینێکی تایبەتیان هەیە، ئەهلی حەق، گۆران.

**کچکە:** گچکە، چکۆلە، بچووك.

**کرۆت:** جۆرێ لە هەرمێ.

**کرۆسك:** هەرمێ کێویلە، هەمرۆ کوجیلە.

**کرێوە:** تۆف، باوبۆران، بادەوە، باهۆ، تێکەڵی بەفر و با پێکەوە.

**کزن:** جۆرێکە لە دانەوێڵە، ولێرە گایە، گاوانە.

**کژ:** کات، وەرزی ساڵ.

**کسپە:** کزەی گیان، هەناو هەژێن، خەم و کەسەر.

**کسم:** ئیش و کار.

**کسۆك:** سەگ.

**کفاح، کیفاح:** قەتڵ، شەڕ، هەرا.

**کل:** ئەبڵەق، ئەسپێ کە خاڵی ڕەش و سپی

پێوەیە/ سورمە، کلە، ماددەیەکە بۆ چاوڕشتن/ خوار، لار/ گومەز/ درەوشانی هەسارە، زۆر چەرموو/ تینی ئاگر/ کوڵەکوڵی گەرما/ کەنار، دوور لە چاوی خەڵك.

**کلاسیك:** وانەیی، قوتابخانەیی، ئەوەی لە زانکۆ و قوتابخانەکان دەخوێنرێ/ شێواز و بەرهەمی کۆن، ئەوەی لە کۆنەوە باو بووە و فۆلکلۆر لەسەری دامەزراوە.

**کڵاشە:** زیاد لە ئەندازە/ خورووی، خورین، ورنایش، خارش، ئالۆش/ تۆڵاش، تەڕاش، تەڵەزمە یان باریکە لە شتێ کە بەهۆی تاشینەوە لێی جیا ئەبێتەوە.

**کڵاوڕۆژن:** کڵاوڕۆژنە، ڕۆچنە، دەلاقە، کولانجە، کولاوەنجە، کوناوەج، کونی سەربان.

**کڵاوەژنۆ:** ئەژنۆ، ئێسکی قول.

**کلتوور، کلدان:** جێگای کلەی چاوان، سورمەدان.

**کلکەسووتێ:** ماستاوکردن، ڕیاییکردن، زمانلووسی، پۆلۆتقەکردن.

**کڵۆش:** ساقە گەنم.

**کڵۆڵ:** بەدبەخت.

**کڵێسە:** کلیسا، شوینی خواپەرستی گاوران.

**کوت:** لە کار کەوتوو بەهۆی ماندووبوونەوە، خۆکوتانە کەسێ.

**کوتوپڕ:** کتوپڕ، لەناکاو.

**کوچك:** بەرد، تەوەنی.

**کوچەڵە:** لە گڵی تایبەت وەکوو لامشت دروست ئەکرێ و ئەدرێ لە بنەی دارقەزوان بۆ تێهاتنی جاجکەتاڵە.

**کوڕوکاڵ:** تاقمێك لە لاوانی تازە پێگەیشتوو.

**کوڕە:** هێی، بۆ جەخت لە پرسیار.

**کولانجە:** دەلاقە، ڕۆچنە، کڵاوڕۆژنە.

**کوللە:** کولە، مەلەکوڕ، کوسك/ تۆڕ یان قوماشێکی ناسك و تایبەت و سپی بۆ خۆ پاراستن لە مێشومەگەز لە کاتی خەو و حەسانەوەدا (پشەبند).

**کوڵوکۆ:** خەم و خەفەت/ قوڵت و کوڵ/ تین و تاوی گەرما/ بریتییە لە سووتان و لەناوچوون.

**کوڵەباڵ:** فەرەنجی بێقۆڵ، پەستەك، جۆرە پەسەکێکە لە خوری دروست ئەکرێ لە بەرگن تایبەتە بە ناوچەی هەورامان.

**کوڵەبنە:** گزگل، کورتەباڵا.

**کوڵەك:** شەل، گیڕ، لە پا سەقەت.

**کوڵەنجە:** سوخمەی قۆڵدار.

**کولۆش:** کلۆش.

**کوڵۆڵ:** کلۆڵ، بەدبەخت، چارەڕەش، ڕۆژڕەش، بەختڕەش، کەسێك ناوچاوانی نایهێنی.

**کوناڕۆژن:** کوناوەج، ڕۆچنە.

**کوونەپەپوو:** کونەبوو، کوندەبەبوو، بایەقوش، پەپوو.

**کوو:** کەی؟ چۆن؟.

**کووتاڵ:** پارچە، قوماش، کاڵا، پەڕۆ، شڕەوبڕەی بازرگانی.

**کووز:** قاژ، قاشی مێوە، چینە/ حەشارگەی کەو/ پشت چەماوە.

**کوێخا:** کەیخا، گزیر، سووریاش، زاوت، پێشکار، کەربەدەستی خان و ئاغا/ کاربەدەستی دێ.

**کەپك:** لووتکە، لووکە.

**کەپوو:** پێشەی لووت/ پووکاوڵە، چەمۆڵە، گەشکە، گزکە، قەپوو/ ددانی پێشین/ پیری و بێددانی.

**کەپۆ:** لووت، کەپوو.

**کەحێل:** ئەسپی ڕەسەن، ئەسپی نەجیب.

**کەرانباوگاو:** جنێوێکە لەبەین خەڵکا.

**کەرتك:** دو نیوە، لەت کراو.

**کەرسەك:** خەرسەك، کۆسپایی، گڵمت، کەستەك، کلۆ، کولۆ خاك، تۆپڵاخ.

**کەڕەك:** فەرەنجی بێ‌قۆڵی درێژ تا ئەژنۆ، کەپەنەك.

**کەژ:** کێو.

**کەفرە:** تاشەبەرد.

**کەفرەکون:** کونەبەرد.

**کەفلەمە:** دەوا و دەرمانێکی خۆراکی.

**کەلەپوور:** میرات، ئەوەی لە مردوو جێ‌ئەمێنێ، جامەنە، هشتە/ کەلوپەلی ناو ماڵ، پیتاك، شاباشی زەماوەند.

**کەڵەگەت:** باڵابەرز، باهۆدار، زەلام.

**کەلەگی:** ئۆدەی ڕوو بە بەرهەیوان/ داڵان، پێشخان، جێگایەکی سەر گیراو بەدەم دەرگای حەوشەوە.

**کەلەموست:** پەنجە گەورە.

**کەڵهوڕ:** کەڵوڕ، یەکێ لە گەورەترین تیرە و خێڵەکانی کورد.

**کەڵۆس:** کوڵۆس، دەم کون، کەڵۆس، ئەوەی کە ددانی پێشەوەی نەمابێ.

**کەنتۆر:** کانتۆر، دۆڵاب، دۆڵابی جل، کومێدی جێگای لیباس، دراوەر (کمد دراور لباس).

**کەندووان:** کەنوو.

**کەندەڵان:** قووڵکە، چاڵ، لێواری قووڵکەی زۆر فراوان.

**کەنوو:** کەنۆڵە، کەندۆڵە، جێگای هەڵگرتنی خەلە و ئارد.

**کەنیسە:** شوێنی خواپەرستی جوولەکە.

**کەوڵ:** پێستی حەیوان، چەرم.

**کەوێ:** کەوا.

**کەوێڵ:** کاسەوکەوێڵ/ کۆخ، خانووی چکۆلە، یانەکڵە، کۆڵیت، کێڵ/ ئەشکەوت، کۆڵیتە، کەپر، ماڵۆچکە.

**کەینوبەین:** پیلان، تەونوبەست، ساتوسەودا، نەخشە، قەرارومەدار.

**کۆتەرە:** قوتەڵە، قۆتەرە، کۆلکەدار، ساقەتی سەرەکی دار بەبێ لق و گەڵا.

**کۆران:** حیلەی ئەسب، شیهە.

**کۆرەك:** کەم‌بینا، چاوکز.

**کۆست:** چارەنووس، کۆس، بەخت، ناوچاو، تالح، بەڵا، تەنگوچەڵەمە، نەهامەت، نەگبەتی، کەڵەمە.

**کۆڵەوەژ:** چڵۆسك، کوڵەوەژ، دارێ کە خۆڵی تەنووری پێ‌تێك دەدەن و کولێرەی پێ سوور دەکەنەوە، بزووت.

**کۆم:** کونای قنگ، کونگ/ تۆپەڵ، کۆمای، کۆمای ساقەتە گەنم، کۆمای خۆڵ و بەرد و... کەڵەکەبوو.

**کۆمپیالە:** سەنەد، بەڵێن‌نامە، بەڵگەنامەیەکی نووسراو کە بەهۆیەوە کەسێك بەڵێن دەدات.

**کێرد:** چەقۆی گەورە.

**کێلان:** کالان، زڵخاو، بەرگی شمشێر و خەنجەر.

**کێوی قاف:** چیایەکی خەیاڵی.

## گ

**گابار:** ئەشکەوت، ئەشکەفت، کاف، کاو، مەرە، زاخە، غار، هلۆڵ و ڕەهۆڵ لە کێودا، کەڵوەز، زاخۆر.

**گازن:** گازندە، لۆمە، سەرکۆنەی دۆستانە، گلەیی، شکات، سکاڵا، پاڕانەوە.

**گاشە:** گەورە، گاشەبەرد، بەردی زل، گابەرد.

**گاڵ:** هەرزن، جۆرێکە لە هەرزن، هەرزنە تاڵە.

**گالۆك:** تێڵا، کوتەك، گۆچان، تەیاخ، لیس، گۆپاڵ، گورز، چۆماخ، داردەستی گەورە و ئەستوور و سەر خڕ.

**گاڵۆك:** گۆچان، چێو، داردەس، داری لێخوڕینی ئاژەڵ، سەوڵەجان، کەواز، داردەستی چەماوە، گواز.

**گاوان:** گایەل لەوەڕێن، شوانی گاگەل، گا چەرێن، گادێر، شوانو گاوا، شوانە.

**گاور:** مەسیحی، فەلە.

**گچکە:** بچووك، گولانە.

**گرتسۆڵە:** گرمۆڵە.

**گرتك:** تیکە گۆشت.

**گرکە:** کاڵەك، زرکە دەیمی.

**گڕگڕ:** دیسان، پەلە/ جاروبار، تاوتاو، گاگا/ جۆری باقلە/ گڕی ئاگر لەسەریەك، گڕەگڕ.

**گرمەژنە:** زیپکەی چکۆلە لەبەر خۆربردن.

**گرمۆڵە:** خرت کردنەوە.

**گرنگ:** پڕبایەخ.

**گروو:** دەرهێنانی پێستی حەیوان لە ملیەوە، کەوڵکردن/ لاشەی حەیوانی سەربڕاو.

**گرووني:** جۆرێکە لە قوماش.

**گرەکە:** پێکەنین.

**گرەو:** بارمتە/ مەرج، شەرت، گرۆ.

**گز:** گزی، گەڕ، فێڵ.

**گزگل:** بستە باڵا، کورتیلە، بابەعەمرە، باواقۆرەت، خڕیلانە، کورتەباڵا، بەرێکی دارمازووە.

**گژن:** مووی تێکهاڵاو، موو گرژ و لوول، شپرزە، پرچی ژاکاو، گژنەسەرە، قژی ئاڵۆزاو/ چاکاو، سیس، چرچ، ترنجاو، پەرێشان.

**گسك:** گزی، گەسك، کەرەستەی ڕامالینی خاکوخۆڵ و شەخەڵ.

**گفت:** قەول.

**گف:** بەنی ڕیسراو.

**گفە:** گفە، هەڕەشە، گورەشە، گەف، تاپاڵ.

**گلاراو:** منالی بزۆزی ئازاردەر، ماخولیا، بێقەراری، ئۆقرە نەگرتن، ئەسپەك، نەخۆشینێ کە مرۆڤ تووشی خەیاڵاتی پڕوپووچ ئەبێ و بڕێ جاریش بە هەموو شتی ڕەشبین و بێمتمانەیە و هەندی جاریش خۆی دەکوژێ، هەست بە چێژ و خۆشی نەکردن، وڕێنەکردن.

**گڵمت، گڵمتك:** کلۆ.

**گلێر:** تلێر، گل، خل (غلتان)/ کۆ.

**گوجیلە:** توتکەسەگ، تووتەڵە، بەچکەسەگ، تووتك.

**گوڕ:** تین، بڵێسە، کڵپە/ چالاکی/ گرمەگرم، شریخە، دەنگی زل/ هەڕەشە، گوڕەشە/ توانا، هێز، تاقەت، وزەی جەستەیی.

**گورین:** سەربڕین، پێست کەندن.

**گولە:** بچووك، کەم باڵا.

**گووژاڵك:** کاڵەکە مارانە، زرکەتاڵ، (هندوانه ابوجهل).

**گوێسوانە، گوێسەبانە:** پاسار/ کەڵکەپاسار.

**گوێقولاخ:** لەسەر هەست، شەوێر، هاگاذار.

**گوێل:** لوێچ، گوێلە، پڕ بە لەپی دەست، لاگوێل، لالوێچ، لامشت/ گوێرەکە.

**گوێئاگردان:** پاڵی تەنوور و قورسی و کوورە، دانیشتن بە دەوری گەرما لە زستانانەدا.

**گەڕ:** گزی، گز.

**گەزۆ:** شەکرۆکە، گەز، گەزولە، شیرینۆکە، هەنێ، ئاونگی شیرین کە لە دارمازوو ئەنیشێ.

**گەندەڵ:** کاری ناشایست/ گومڕایی.

**گەنەکەوڵە:** گەنێ، کەوگی قەوی، جۆرێکە لە گەنە کە بە ماڵاتەوە دەنووسێ.

**گۆبەن:** ڕستەی گۆی خشڵ، کێشە و ئاژاوە،

ئاژاولێ، قەومان، کەتن، بشێوە/ کۆبوونەوە بۆ بەزم و شادی،
**گۆبەند:** گۆبەن، گۆڤەند، خۆشی و شادمانی زۆر، زەماوەند.
**گۆپاڵ:** گۆچان/ تێلا.
**گۆتاڵ، گۆتەڵ:** ماڵات، پاتاڵ، دەوڵەت، چوارپێ، گاوگۆڵ، ئاژاڵ، ئاژەڵی دەستەمۆی ئاڵفخۆر.
**گۆخل:** شارەزا لە کاری مەرەزەدا، وەڕاز، چەڵتووكچێن. (خبره در شالیکاری).
**گۆرەویلە:** گۆرەواچن، گۆرەوی‌چنە، دووکەڕێس.
**گۆڤار:** مەجەلە، ڕۆژنامە.
**گۆگرد:** شقارتە، شەمچە، ئشقارتێ، کرمیت، کانزایەکی زەردە زوو ئاگر دەگرێ، شخاتە.
**گۆلك:** گوێرەکە، گوێلك، گۆرەکە، گوور، بەچکەی مانگا.
**گۆلەگۆل:** ئارام و بە سەبر ڕۆیشتن، هێورهێور، قۆلەقۆل، نەرمەنەرم، لەنگارلەنگار.
**گیتی:** جیهان، تەواوی زەمان و ئەوەی تێیدایە.
**گیز:** گوێز، وەزی.
**گیسك:** بێچووی بزن لە پێنج مانگە تا یەك ساڵ، توشتر، کار، کارژەلە، بزلە، ساواڵە.
**گیڤ:** لەبەردەست و شیاوی کەڵك وەرگرتن/ لە هەوێڵدا بوون/ ئامادە، تەیار، سازکراو.
**گیوە:** کالە، کاڵاش، جۆرێکە لە کڵاش، کڵاشی بنچەرم/ نۆرە، نۆبە، سەرە، نۆکە، گۆڤی، کەشە.
**گێتکە:** وردە هەرزن/ کولێرەی هەرزن/ بەرگ‌شڕ، ڕووت و نەدار.
**گێرەوسار:** هەوساری گوێرەکە.
**گێزەر:** هەویج.

# ل

**«لاأقرأ»:** ناخوێنم.
**لاپاڵ:** قەدپاڵی کێو، هەوراز، گەوە، قەدیارە، بەروار، کاشیان/ تەنیشت، پاڵوو، پەنا، بنپاڵ، لایاڵ.
**لارەسەنگ:** لاخوار، لالەنگ، سەنگەلا، باری خوار، تاسەنگ.
**لاگیرە:** تۆق، خشڵێکی ژنانەیە لەسەر هەوری و حەگاڵ دەبەسرێت یان قژی پێ ڕاگیر دەکرێت، بانپووشین.
**لالۆپاڵ:** بێدەنگ و بێ‌سەروزمان.
**لباد:** نەوگ، نمەد، بەرگن، بەرگنی پەستواو، کولاڤ، نەوو.
**لبادە:** فەرەنجی، کوڵەباڵ.
**لرخ:** خڕخڕەی سنگ، لرچە، هاڕەوسینەی.
**لرفە:** دەنگی لافاوی بەتەوژم، لووشە/ دەنگی گڕەی تەنوور/ قووت‌دان، هەڵلووشان.
**لغاو:** لەغاو، جڵەو، لەغام، ئامرازێکی ئاسنینە ئەخرێتە دەمی وڵاخی سوارییەوە، دەستەجڵەو.
**لمۆز، لمووز:** پۆزە، دەم و کەپووی حەیوان، قەپۆز.
**لووتوپووت:** بۆڵەبۆڵ، پرمە، خوتە.
**لووشکە:** لەقە، جووتە/ پرمە و بۆڵەی ئاژەڵی یەك‌سم بۆ ئالیك و ئاڵف.
**لوێچ:** لالوێچ، گوێل.
**لەپەساوەر:** بڕوێش بە نەخۆشەر.
**لەتك:** لەت، پارچە، نیوە.
**لەتکە:** میوەی قاش‌کراو و وشك‌کراو لەبەر هەتاو بۆ زستان.
**لەچك:** سەرپۆش، حەگاڵ.

**لەندەهۆڕ:** زەبەلاح.

**لهۆن:** بەشێکە لە هەورامان.

**لۆ:** بۆ؟

**لۆقەنە، لۆقەنتە:** لۆقەنە، چێشتخانەی گران، ڕستووران.

**لۆکەلۆك:** لۆقەلۆق، لۆقە، قۆرتە، گورگەلۆقێ، قۆترە.

**لێوالێو:** پڕ، کەلەڕژ.

# م

**ما:** بۆ؟ بۆچ؟

**ماخۆلان:** خولخولە، نەخۆشی سەر لەرزین.

**مارەبەجاش:** کەسێ ژنەکەی سێتەڵاقەی کەوتبێ، بیەوێ دووبارە مارەی ببڕێتەوە بۆ خۆی، دوای تێپەڕکردنی ماوەی شەرعی (عیددە) شوو ئەکا بە کەسێکیتر، پاشان ئەمیش دوای چوونەلای تەڵاقی ئەداتەو پاش تەواوبوونی عیددە، شووە پێشووەکەی ئەتوانێ مارەی ببڕێتەوە، بەمکارە ئەڵێن مارەبەجاش.

**ماستاوکردن:** کلکەسووتێ.

**ماش:** جۆرێکە لە دانەوێکە لە تیرەی نیسك.

**ماشوبرنج:** بریتییە لە تێکەڵبوونی مووی ڕەش و سپی لە سەر و ڕیشدا.

**مافوور:** قاڵی، ڕایەخی بە تەون تەنراوی پرزەدار، فەرش.

**مافەتە:** مافەتا، دەرد، پەتا، دەردی گیرۆ/ پیاوی خراپ و بەئازار.

**مالووم:** مالوم، پیاوی ئایینی جوولەکە/ مەعلووم، زانراو.

**مالۆس:** خووگ، بەرازی مێ.

**مامڵە:** مامەڵە، سەودا، ئاڵوویر، کڕین و فرۆشتن.

**مامۆتك:** زۆر زانا و عاقڵ و ژیر.

**مان:** مانگ/ مانەوە، نەچوون/ نەمردن/ پەڵپ، گرۆ، (اعتصاب).

**ماوت:** ماهووت، جۆرە قوماشێکە.

**مایەسیری:** جۆرە نەخۆشینێکە مرۆڤ لە ڕێگای کۆمەوە تووشی ئەبێ.

**مجەور:** مجێور، خزمەتکاری مزگەوت، خاڎەم.

**مچە:** موستەفا.

**مراز:** نیازی دڵ، مراد، خواست، ئاوات، حەز.

**مرخ:** هەوەس، خەیاڵی تەماحکارانە، ئارەزوو، حەز، تەبیعەت/ تەماح/ توانایی، لێهاتوویی، ژێهاتی، لەباربوون/ پرخە، دەنگ هاتن لە سنگەوە، لرخە.

**مرقە:** مرقاندن، دەنگی گەروو بە دەمی قووچاو/ بە تاسەوە مژینی مەمکی دایك.

**مز:** مزە، کرێ، حەقدەست/ ترش و شیرین/ بەچکە ئاسك/ گووشین.

**مزراح:** مازرۆح، خولخولە، ماخۆلان.

**مزەڕەت:** بەڵا، چورتم، بەسەرهاتی ناخۆش، تەگەرە، فەتەڕات.

**مست:** مشت، ئەندازەی دوو لالوێچ، لەپ، بەری دەست.

**مسکێن:** هەژار، ڕەعیەت.

**مسگەر:** مزگەر، وەستای سپیکردنەوەی قاپ و قاچاخی مسین.

**مشتوو:** دەسەی خەنجەر و کێرد.

**مشکی:** ڕەش/ ڕەشتی، شەدە، (دستار).

**مفەرك:** میفەرك، تەبەرك.

**ملپێچی:** ملەجوێڕێ، گوێنەدان.

**ملهوڕ:** شەلات، کەڵەگا، چەکمەبۆر، زۆردار، سەرکێش/ جۆرێکە لە باڵندە.

**منارە:** جێگای بانگدان.

**منجڕ:** چەنەباز، چەقاوەسوو.

**مورید:** شوێنکەوتووی پیری تەریقەت/ تۆبەکار لەسەر دەستی شێخ.

**موزاهەرە (مظاهَرە):** خۆپیشاندان.

**موستەعید (مُستعِد):** ئەو فەقێیەی باڵاخوێنە و سوختە لە ژێر دەستیایە.

**موعجیزە:** کاری سەرسام هێنەری پێچەوانەی عادەت، نائاسایی، لە ڕادەبەدەر، سەرئاسا.

**مووسڵدان:** میزڵدان، (مثانە).

**مووشەدەمە:** دەمەی ئاسنگەر.

**مووشێن:** مازوولێن، کەلایێن، هەڵماتێن.

**مەتالیك:** پارەی هەرە ورد و بچکۆلەی دەورانی عوسمانی.

**مەتبەخ (مَطبَخ):** چێشتخانە.

**مەتەڵ:** لەگەز، لیچاڕ (چیستان).

**مەجە:** «مجید».

**مەجەلە (مجله):** گۆڤار.

**مەجیدی:** پووڵێکی زەمانی عوسمانی.

**مەحەنەك:** جۆریکە لە مایین.

**مەخمەرە:** جامانە.

**مەرزە:** گیایەکی گەڵاوردی بۆنخۆشی کوێستانی و خۆماڵییە/ ناوە بۆ ژنان.

**مەڕنەمووکە:** فریشتەی پرسیاری ناو گۆڕ.

**مەرویێ:** هەرمێ، مرویێ.

**مەرە:** گرفتاری.

**مەزبەتە:** داواکاری نووسراوە و ئیمزاکراو.

**مەزەو:** مەزهەب، مەسەو.

**مەعجوون (مَعجون):** تێکەڵکراوی چەند جۆرە خۆراك یان هەر شتیتر بۆ دەرمان و خواردنەوە.

**مەکات:** پووشانە، سەرانەی ئاژەڵ.

**مەکوو:** مەکۆی ڕستن.

**مەگەر:** مەگیر، تمەز.

**مەنگ:** ئاوی مەنگ، وەستاو.

**مەنگوڕ:** خێڵێکی کوردی ناوچەی موکریانە.

**مەوبەق:** بەشی ژوور و خواری کانتۆر، تەبەق، ئاشپەزخانە.

**مەهانە:** بەهانە، بیانوو.

**مۆبیل:** موبل، جێگای دانیشتن.

**مۆزیقار:** موزیقاژەن.

**مۆم:** شەمع.

**میفەرك:** تەبەرك.

**میکائیل:** فریشتە پایەبەرزەکانی خوا، مەعمووری ڕزقوڕۆزی و باوباران.

**مێخەلەمە:** هێلکەوڕۆن.

**مێزەر:** جامانە، ڕەشتی، کێش.

**مێکوتە:** نەخۆشینێکە ئەبێتە هۆی زیپکە دەردانی پێست بە زۆری لە مناڵاندا، ئاوڵە، دانکە، سوورێجە.

**مێگەل:** ڕانی بزن و پەز، گەلە.

## ن

**ناجسن:** بەدجنس، بەدفەڕ، نائەسڵ، نارەسەن، نانەجیب، دڵپیس، بەدخوا.

**ناری عەلی:** زەحمەت و ماندوو بوونی زۆر.

**ناقۆڵا:** نابار.

**ناوساجی:** کولیچە، کولووچە، جۆرە کولێرەیەکە لەناو ڕۆن درووست ئەکرێ.

**ناوە:** دەفرێکی گەورەی گڵ کێشانە بۆ سەر بان.

**نڕناش:** عیفریت، جنۆکە، دێو.

**نفوورات:** بەدفەڕ، زیانبار/ سەیروسەمەر.

**نقوم:** چوونە ژێرِ ئاو، خنکان.

**نوردوو:** نۆردوو، دەستە نانێکی پێکەوە

پێچراو، مووچە نان.

**نووزە:** دەنگی گریان و هاواری لەسەرخۆ.

**نوێردە:** دوورینی لێواری لیباس و کراس و پارچە.

**نوێن:** نما، دیمەن، شاندان/ کەلوپەلی خەو، پێخەف، جێوبان/ تازە/ گوێرەکەی سێ ساڵە.

**نەخۆشەر:** لەتکە، لەپە.

**نەر:** گۆشە، سووچ، قوژبن/ لا، پاڵ.

**نەرمەغار:** غاری لەسەرخۆ، پێچەوانەی چوارناڵە.

**نەقیزە:** داری لێخوڕینی وڵاخ.

**نەکەرۆز:** زۆر سارد/ ناوی کوێستانیکی کوردەوارییە.

**نەوازش:** لاوانەوە، دڵدانەوە، لاوناى، دڵخۆشی دانەوە، دڵنەوایی.

**نهۆم:** تەبەقە.

**نۆما:** جوانووی وڵاخ، جوانوو ئەسپی دوو ساڵە.

**نیخەنیخ:** هانکەهانک، مشەمش، نرکەنرک/ حیلەی ئەسپ/ مرخەمرخی قوڕگ.

**نیسکێنە بە نۆک:** جۆرێکە لە چێشتەکانی کوردەواری.

**نیشاستە:** گووشراوەی ئاردەبەهاړووی لە ئاوکراوی پاڵێوراو کە وشك دەبێتەوە، نشاستە.

**نێرگەلە:** قلیانی ئاوی.

**نێرموك:** نێرووك، نێرەموك: دووزایەند، نێرومێریال دووجنسە، (خُنثی).

**نێڵ:** شۆڵەی ئاگر.

## و

**واز:** مەیل، ئارەزوو.

**واق:** قووەت، بیر و هۆش، مێشك.

**واك:** ماسیگرە، واقواق/ شت، وانێك، ئیشارە بۆ شتێ.

**والی:** حاکمی وڵات.

**وانێك:** واك، ئەو شتەی کە ناوی نابرێ، هین/ کاورا، فیسار، فڵان.

**وتەبا:** فتق، ماسینی هێلکەگون.

**وجاخ:** ئاگردان، نەجیب، ڕێباز.

**وڕ:** گێج، سەرسام.

**ورت:** پێچەوانەی درشت، قسە بە هێواشی، ویرد، چپە، ورتە.

**ورووکان:** دەورەدان لە هەموو لایەکەوە، ئابڵۆقە، گەمارۆ.

**وزە:** هێز، قەوە، نیروو.

**وسڵ (غُسل):** شۆرین، شۆرینی لاشە لەبەر لەشپیسی.

**وڵ:** نان، نانە وردە، نانە ڕەقە/ کون.

**وو:** بوو.

**وەجاخ:** وجاخ، وەجاغ، کوورەی نەوتی، کوانوو، ئاگردان، ئارگا، ئاتەشگا، دێزپا، ڕەسەن، ئەسڵزادە/ خانەدانی بەمیوان.

**وەچە:** وەچ، بێچوو/ لك و لقی دار/ نەوە و نەتیجە/ قازانج و بەهرە.

**وەرد:** زیاتر لە جارێ زەوی کێڵان/ ژێروژوورکردنی زەوی/ دووپاتکردنەوەی هەر ئیشێ.

**وەڕز، وەڕس:** قەڵس، وەڕەز، عاجز، بێتاقەت.

**وەرزێر:** جووتیار.

**وەسواس:** حەمبەڵ، وازواز، ڕاڕا، تاوتاو، دووشك، هەردەم لەسەر خەیاڵێ، جۆرە نەخۆشینێکی دەروونییە/ قیزەون، بەقێزوبێز لە خواردندا.

**وەعز:** ئامۆژگاری.

**وەڵاش:** ناوی گوندێکە لە باشووری کوردستان.

**ویرد:** دوعا، ورت.

**وێزە:** پەلاماری پەنامەکی بۆ بردن، لێدان.

## هـ

**هات:** تالع.

**هاڵوهەواڵ:** خەبەر، دەنگوباس.

**هاموشۆ:** هاتوچۆ، ئاموشۆ، هاتوچۆ، هاتوچوو، ئامشۆ، دیداری دۆستانە.

**هروژم:** هێرش، پەلامار، هەڵمەت، دەستدرێژی.

**هورگ:** ورگ.

**هومە:** خوم، کووپ، دەفرێ کە لە سواڵەت دروستکرابێ.

**هەپروون:** ورد و خاش، لەتوکوت.

**هەتیو:** ئەو منالەی باوکی نەماوە.

**هەراش:** لە کاتی گەشەکردندا.

**هەرامە:** ئەو شتە، ئەوە، ئانە.

**هەراوهوریا:** هەراوزەنا، جەنجاڵ، گاڵەگاڵ، چەقەوگورە، قیرەوهەرا، قاوەقاو.

**هەرزن:** دانەوێڵەیەکی سووری زۆر وردە لە کاتـی خۆیدا کراوە بە نان بۆ بژێوی، ئێستە زۆرتر خواردنی مامر و مەل و پەلەوەرە.

**هەرمێن:** رەواج.

**هەرە:** مشار.

**هەرۆ:** بچۆ، هەر رۆ، هەر رۆژ.

**هەزارپیشە:** سندووقێکی دارین چین‌چینە و زۆر شتی تێ‌ئەخرێ/ کەسێ کە سەری لە زۆر کار دەرئەچێ.

**هەزبیە:** هەزبێ، گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانی و خۆماڵییە.

**هەسان:** بەردەسان، بەردێکە بۆ ساوین و تیژکردنەوەی تێخ و چەقۆ و کافرمان.

**هەستوون:** کۆڵەکە.

**هەسونیس:** هەست و نیست.

**هەلاج:** پەرەکەر، کەڤانژەن، کەسێ کە لۆکە و خوری شی دەکاتەوە.

**هەڵبڵۆقان:** بە گورجوگۆڵی جووڵان/ بەرزبوونەوە و داکەوتنی لەدوای یەك بە پەلە، هەڵخستنەوە.

**هەڵمات:** کەلا، تیلە.

**هەڵوا:** حەلوا، چێشتی ئارد و دۆشاو و رۆن.

**هەڵەنگان:** گلیان، پا هەڵکەوتن، هورداریای.

**هەمەوەن:** ناوی عەشیرەتێکی کوردن.

**هەنووکە:** هەر ئێستا.

**هەنی:** شووتی، شامی.

**هەیدی:** هەیدێ، برۆ لاچۆ.

**هۆبە:** ئۆبە، جێگەی کۆمەڵە چادر پێکەوە، دەوار.

**هۆدە:** ژوور، ئۆدە، وەتاغ، دیو، دیم، وەتاق.

**هۆری:** حۆری بەهەشت.

**هۆقە:** فێڵ، تەڵەکە/ دەنگی گامێش، هۆق/ وەقە، سەنگێکە بۆ شت کێشان.

**هۆگر:** خوو گرتوو.

**هۆنەهۆنە:** فرمێسك ڕژاندن، گریانی لەسەرخۆ.

**هیزە:** خیگە، شوێنی رۆن و دۆشاو کە لە پێست دروست ئەکرێ.

## ی

**یاپراخ:** دۆڵمە.

**یخ:** سەهۆڵ.

**یورتمە:** هێلکە، رەوتی نیوەغاری ئەسپ و مایین.

**یوسر:** تەزبێحی یوسر.

**یەخنی:** ئاوگۆشت.

**یەد (یَد):** دەست.

**یەنموور:** کیسە پووڵ.